# ڕۆڤار

70


سەرپەرشتیاری گشتی
ڕەووف بێگەرد

هەڵسوڕێنەری ڕۆڤار
کامەران سوبحان

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

تایپیست
ئارام مەحمود

هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن
3120890

Web Site
www.serdam.org

پەیوەندیکردن بە ڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.rovar@yahoo.com



چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم


## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی،حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، ملا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادر، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزا، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی.

**مۆتیڤی ئەم ژمارەیە (قەرەنی جەمیل)**

## پێڕست


| | | |
|---|---|---|
| *قەرەنی جەمیل بە قەڵەمی خۆی | | ٦ |
| * ئارکیۆلۆژیای واتا لەکارەکانی قەرەنی جەمیلدا | - وەهبی رەسوڵ | ٨ |
| * خوێندنەوەیەکی سیمیۆلۆژی- هێرمۆنۆتیکی | - د.جەزا بەکر | ١٦ |
| * قەرەنی جەمیل رۆح بە بەر قوڕدا دەکاتەوە | - ئەحمەدی مەلا | ٢٠ |
| * کوشتنی ئاماژە باوەکان | - ستار قادر | ٢٢ |
| *دیمانەیەك لەگەڵ قەرەنی جەمیل | - بەختیار سەعید | ٢٦ |
| * لەبارەی ئەرکیۆلۆژیای کات و شوێن | - رۆڤار | ٣٢ |
| * ئاو لەبن تاشە سەختەندازەکاندا | - کەریم دەشتی | ٣٥ |
| * نزگەیەك لەگەڵ قەرەنی جەمیل... | - دڵشاد عەبدوڵلا | ٣٨ |
| * تەرازووی شێواو | - قەرەنی جەمیل | ٤٠ |
| * زمانی هونەر لە تابلۆکانی قەرەنی جەمیل-دا | - شێرکۆ جەلال | ٤٨ |
| * قۆناغە هونەرییەکانی قەرەنی جەمیل | - دارا محەمەد عەلی | ٥٤ |
| * بایۆگرافیای نیگای قەرەنی جەمیل | - د. موحسین ئەحمەد عومەر | ٦٠ |
| * گەڕان بەشوێن جێ پێکانی قەرەنی جەمیلدا | - سامی حەمە | ٦٤ |

# قەرەنی جەمیل

* لەخولی نوێی دەرچوونی ڕۆڤاردا، ئەمە سێیەم جارە ژمارەیەك تایبەت دەكەین
بە داهێنەرێكی كوردەوە، كە تا ئێستا خۆی لە ژیاندا مابێت، ژمارەكانی پێشتر
ڕۆڤارێكمان بۆ بەڕێزان محەمەدی مەلا كەریم و ئەنوەر قەرەداخی دەركرد و ئەم
جارەش بۆ قەرەنی جەمیل، ئامانج لەم كارەشمان بەسەر كردنەوەی ئەو نووسەر
و هونەرمەندە داهێنەرە كوردانەیە، كە لە لایەنێك لە لایەنە جیاوازەكانی كاری
هونەریی و ڕۆشنبیرییدا جێگە دەستیان دیارە و تا ئێستاش لە ژیاندا ماون، بەو
هیوایەی لە ژمارەكانی داهاتووشدا چەند كەسایەتییەكی تر بەسەر بكەینەوە.
*لەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا كۆمەڵێك نووسەر و هونەرمەندی كورد قسەیان لەسەر هونەر
و تایبەتمەندییەكانی هونەرمەند قەرەنی جەمیل كردووە، چ لە ڕووی تەكنیك چ
لەڕووی توانای هونەریی و ئاستی هونەریی ئەم هونەرمەندە، لە قۆناغە جیاوازەكانی
كاركردنییەوە لە حەفتاكانەوە تا ئێستا، ئێمەش زیاتر مەبەستمان بوو سەرجەم
ویستگە و ڕەهەندە جیاوازەكانی كاركردنی ئەو هونەرمەندە لەو قۆناغە جیاوازانەدا
بخەینە بەردیدەی خوێنەران و ئاوڕێك لەو هونەرمەندە داهێنەرەی كورد بدەینەوە
كە تا ئێستا وەك پێویست ئاوڕ لە هونەرەكەی نەدراوەتەوە، ڕەنگە قەرەنی یەكێك
بێت لەو هونەرمەندانە.
*ئەوەی لەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا زۆر دیارە و خوێنەر هەستی پێدەكات بەسەر
كردنەوەی هەموو قۆناغە جیاوازەكانی كاركردنی هونەریی ئەم هونەرمەندەیە و
هەڵوێستە كردنە لەسەر ستایلە جیاوازەكانی لە كاری هێڵكارییەوە بۆ پۆرترێت
و كاری گوزارشتی و ئەپستراكت و مۆدێرن و ...هتد، ئەمە دەرفەتێكی باشە
بۆ هونەرمەندان و ڕەخنەگرانی هونەریی بۆ ئاشنابوون بە جیهانە فراوانە
هونەرییەكەی قەرەنی.
* یەكێكی تر لە جیاوازییەكانی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار لە چاو هەموو ژمارەكانی
تردا (ڕەنگاوڕەنگی)ییەتی، ئەمەش دەبێتە یەكەم ژمارەی ڕۆڤار بە ڕەنگاو ڕەنگی
دەرچووبێت، ئامانجی سەرەكی ئەم كارەشمان دەرخستنی رووخساری ڕاستەقینەی
تابلۆ و ڕەنگە تایبەتییەكانی ئەم هونەرمەندەیە، چونكە ناكرێت نووسەر و
ڕەخنەگرێك باس لە ڕەنگ و تەكنیكی هونەریی بكات و تابلۆكانیش بە ڕەش و سپی
بێت، بۆیە بڕیارماندا ئەم ژمارەیە بۆ دەرخستنی رووخساری جوانی تابلۆكانی ئەم
هونەرمەندە كوردە سەرجەم لاپەرەكان بە ڕەنگا و ڕەنگ چاپ بكەین.
* هیوادارین لە ژمارەكانی داهاتووشدا هەوڵەكانمان بۆ بەسەركردنەوەی داهێنەرانی
تری كورد هەموو سنوور و ژانرە جیاوازەكانی تر بگرێتەوە.

ڕۆڤار

## قەرەنی جەمیل بە قەڵەمی خۆی:

قەرەنی جەمیل حەسەن **Karani Jamil Hasan**

١٩٥٤- لە هەولێر لە دایکبووە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە.

١٩٧٦-٧٧ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی لە بەغدا تەواو کردووە.

١٩٧٧- ٧٨ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی گوندی (ڕوستێ) بووە، پاش چۆلکردنی لە لایەن حکومەتەوە، ١٩٧٨- ٧٩ گواسترایەوە قوتابخانەی سەرەتایی گوندی (ناوڕۆیین)/ دیانا.

١٩٧٩- بەرەو ئیتاڵیا ڕۆیشت، تا ساڵی ١٩٨٤ لە ئیتاڵیا مایەوە، هەر لە هونەری شێوەکاری کاری کردووە و پێی ژیاوە.

١٩٨٤- لە ئیتاڵیاوە بەرەو ئیسپانیا ڕۆیشت، تاکو ئەمساڵانەی دووایی ٢٠٠٢ هەر لەوێ کاری هونەری کردووە. لە نێوان ئەو ساڵانەدا ماوەی چوار ساڵ لە هۆڵەندا مایەوە و پاشان گەڕاوەتەوە ئیسپانیا.

لە ٢٠٠٣ تا ئێستا سەرنووسەری گۆڤاری شێوەکارییە و مامۆستاشە لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی هەولێر لە بەشی شێوەکاری.

پێشانگە تایبەتییەکان:

١٩٧٦- لە بەغدا هۆڵی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی لەگەڵ هونەرمەند جەمال ئیبراهیم.

١٩٧٧- لە هەولێر هۆڵی قوتابخانەی میدیا

١٩٨٤- لە بەرشەلۆنە/ ئیسپانیا هۆڵی **Prat de lujanes**

١٩٨٧- لە گرانادە/ ئیسپانیا هۆڵی **Caja rural**

١٩٨٩- لە گرانادە/ئیسپانیا قاوەخانەی **Volter**

١٩٩٠- لە ڤالێنسیا/ ئیسپانیا هۆڵی **Alhanas**

٢٠٠٧- لە هەولێر هۆڵی میدیا

٢٠٠٨- لە سلێمانی گەلەری سەردەم

پێشانگە هاوبەشییەکان:

هەر لە ساڵی ١٩٧٢ تا ئێستا لە عێراق، ئیتاڵیا، ئیسپانیا، ئینگلتەرا، هۆڵەندا، بەلجیکا، دانمارك، نەمسا، پۆڵۆنیا، بەشداری کۆمەڵێك پێشانگەی هاوبەشی کردووە.

# ئارکیۆلۆژیای واتا
# یا تێپەڕاندن لە پەخشێکی
# ئایکۆنی
# لە کارە هونەرییەکانی
# (قەرەنی جەمیل) دا

وەهبی ڕەسوڵ

## (دەربڕین خۆی هونەر نییە، بەڵکو ئەوە هونەرە کە دەربڕینەکە دەیگەیەنێت)

### هۆستۆن ستیوارت چامبەرلین

لە دووتوێی ئەم وتارەدا ئەو خەسڵەتەی کارکردنی هونەریی لە دەقێکی بینەیدا جێ مەبەستی ئێمەیە، کە وەرچەرخانێکی دروستکردووە، لە تێڕوانینی هونەرمەندی بە ئەزمون و خاوەن باکگراوندێکی بەپیتی هونەریی (قەرەنی جەمیل)دا. کە ئەویش تێپەڕاندنە لە دەسەڵاتی بە هەژمونی مێژوویانەی فۆرم، وەك نیشانەیەك، لە دۆخی ئایکۆنی بوونی خۆی (چون نیشانە لەدەقی بینەیدا سەرەتا ئایکۆنیانە سەرچاوە دەگرێت، واتە هەڵگری پەیوەندییەکی لێکچووی هاوشێوەی داخراو و دیاریکراوە، بەڵام لە ئاوێتە بوونیدا بەکۆ بنیادە جیاجیاکانی پێکهاتن و خۆ دروستکردنەوە، دەچێتە ئاسۆیەکی کراوەوە) و لەو ڕێگەیەشەوە، بەزاندنی سنووری داخراوی توانا گوزارشتیەکانی خودی فۆرم تێدەپەڕێنێت، کە بە زوبانێکی تر پێی دەوترێت، دەرچوون لە سیستمی کارکردن لە تۆڕێکی داخراوەوە، بە ئاراستەی تۆڕێکی کراوە.
تێکشکاندنی سیستمی کارکردنێك کە تێیدا، تۆڕێکی داخراو وەك پەیوەندییەکی بونیادی، هەژمونگەرابێت، بەرەنجامێکە کە دەبێت هونەرمەند سەرلەنوێ و لە کۆبنیادێك/کۆنتێکستێك/ی تردا، پەیوەندییە بونیادیەکانی دەقی بینەیی دابڕێژێتەوە. ئەو دەمەش دەقی بینەیی دەبێتە چنراوێك لە کۆمەڵێ پەیوەندی بە دوایەکدا هاتوو، کە لەناو خۆیاندا لێکتر دەئاڵێن، تا مەرجی دەرکەوتنی دەق بئەفرێنن، " چونکە بونیادی هەر شتێك تەنها وێنە و هەیکەل و یەکەی ماددی، یاخود ئەو دیزاینە هەمەکییە نییە کە پارچەکانی پەیوەست دەکاتەوە، بەڵکو ئەو ڕێسایەیە کە پێکهاتەی شتەکان لێکدەداتەوە"(ابراهیم زکریا: مشکلە البنیە،ص٣٣) ئەمە لە ساتێکدا کرانەوە توانای گواستنەوە و گۆڕانمان دەداتێ، لە بونیادێکەوە بۆ بونیادێکی تر، لە بونیادێکی داخراوی واقیعییەوە، بۆ بونیادێکی هێماگەرایی (ڕەمزی) کە ڕێگەکانی دیاریکراو نییە و نابێت، تەنها بە چڕکردنەوە و ڕاڤەکاریی نەبێت.
ڕاستە نیشانە/فۆرم/ لەدەقی بینەییدا سەرەتا ئایکۆنیانە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام لە پرۆسێسی ئاوێتە بونیدا دەچێتە ئاسۆیەکی کراوەوە.(وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا) ئەم ئاسۆ نوێیەش ئامانجی لەوەدا خۆ دەنوێنێ نیشانە لە داتایەکی دیاری تاك ڕەهەندی خوێندراوەوە، بگۆڕڕێتە سەر داتایەکی شاراوەی نەخوێندراوە و فرە ڕەهەند، یاخود ئاڵۆز لە خوێندنەوەدا، ئەم هاوکێشەیە نەك هەر لەسەر ئەو جۆرە نیشانانە پیادە دەبێت، کە بە نیشانە ڕەمەك(عەفەوی) یەکان ناسراوە و خوێنەر/ وەرگر/ توانای ناسینەوە و

شێوەی ١

شێوەی٢

خوێندنەوەی (گەر بە رووکەشیش بێت) نییە. بەڵکو(ئەم هاوکێشەیە) بەسەر نیشانە ئایکۆنییە ناسراو و ئاشناکانیشدا هەمان کێشە و دەرئەنجامی دەبێت، چونکە لە ئاسۆ داخراو و تاك ڕەهەندەکەی تێدەپەڕێنێت. ئەمەش حاڵەتێکە هەژمونگەرا لە زۆرێك لە کارە هونەرییەکانی ئەم ساڵانەی دوا دوایی هونەرمەندا بەرچاو دەکەوێت. گەر بە دیاریکراوی گەڕانێك بەناو کارە هونەرییەکانیدا بکەین و بۆ دەرکەوتنی ئەم حاڵەتە بگەڕێین، ئەوا بۆ نمونە لە شێوەی (١) دا دەبینین :

فۆڕمی/نیشانەی/ ئاسك لەلای هونەرمەند، لەم دەقەدا چیتر (ئاسك) وەك نیشانەیەك، واتا تەقلیدییەکەی خۆی وەك ئاژەڵێك پەخش ناکات، بەڵکو بە هاوشانی یەکەکانی تری پێکهاتوو لەسیستمی پەیوەندییە بونیادییەکانی نێو دەقەکە، خۆ بەرەو ئاسۆی نوێتر ئاراستە دەکات. بەتایبەت ئەو یەکانە (جگە لە بوونی فۆڕمی چەند فیگەرێك لە بەشی خوارووی لای چەپی تابلۆکە) هیچ یەکەیەکی تری دەستنیشانکراو لەخۆ ناگرێت، نەك هەر هێندە، بەڵکو هەستکردنی بوونی (جێگە/شوێن)یشمان لێ دەستێنێتەوە، کە هەر ئەم نەمانی هەستکردنە بە بوونی جێگە خۆی لە خۆیدا هەستکردن بە بوونی (زەمەن)یش، بۆ بینەر، لەتەك خۆیدا ون دەکات. هەرچەندە بەدیهێنانی ئەم جۆرە بەرەنجامە لە سەرجەمی کارەکاندا هەمان بەریەککەوتنیان بەدەست نەهێناوە و ناهێنن. بەڵکو لە هەندێ کاری تردا هەستکردن بە بوونی ئاسۆ ئامادەیی بەهێز و پتەوی هەیە کە وادەکات و هەستکردن بە ڕەهەندی قووڵیی توانایەکی فشارگەرای خۆی هەبێت، و هەر لەو ڕوانینەشەوە ئامادەیی هەستکردنی جێگەیی کارایانە خۆی ئاراستە بکات. بۆ ئەم مەبەستەش بڕوانە شێوەکانی (٢)(٣)(٤)(٩) تەنانەت ئەم هەستکردنە لە شێوەی (٨)دا بە شێوەیەکی سروشگەرا (ئیحائی)یانەش بێت ئامادەیی خۆی هەیە. بەڵام ئەم حاڵەتە لە شێوەکانی (٥)(٦)(٧) دا بەدی ناکرێت. دیاردەی ئەم بەخشینە شوێنکاتییە لە دەقدا و هاوکات لێ سەندنەوەی، دەستپێکی بوونی ئەو پەیوەندییە جەدەلیانەیە کە دواتر دێینە سەر ئاماژە پێدانیان.

گەر بگەڕێینەوە سەر مامەڵە نیشانەییەکانی هونەرمەند، ئەوا دەڵێین، وێڕای شێوەی یەکەم هەمان مامەڵەی نیشانەیی، لە نیشانەکانی (سەگ) شێوەی (٢)(٣)(٩)، (ئینجانە) شێوەی (٤)، (دەموچاوێکی ئاسەواریی کۆن) شێوەی(٥)، دەردەکەون. ئەمانە گشت سەرباری بەکارهێنانی کۆلاجیانەی ئامرازی وەك (واشەر، برغوو، دراوی کانزایی) (فۆڕمی ڕاستەخۆ)، کە لە ئەرکە ئاساییەکەی ڕۆژانەی خۆیان و پەخشە فۆڕمییە ئایکۆنییەکەی خۆیانی دەرکردوون، بەرەو ڕەهەندگەلێکی تری کراوە لە گوزارشتکردن و

شێوەی٣

شێوەی٤



جوانیدا، بە پێی ئەو توانا تەعبیرییانەی سیستمی سەربەخۆی پێکهاتەی دەق ئاراستەیان دەکات. (سۆسیر)دەربارەی ئەم حاڵەتەی دەق دەڵێت:" بەدیهێنانی ئەم جۆرە سیستمە، سیستمێکە سەربەخۆ، بۆ هیچ شتێکی تر ناگێڕێتەوە، خودی خۆی نەبێت، هاوشانی حوکمکردنی پەیوەندییە خۆبەخۆکانی لە کارکردنیدا لە بەکارهێنانی واتا و ئاماژەکانیدا"(سوسیر، فردیناند: علم اللغه العام، ص٨٤)

سەرباری خوڵقاندنی ئەم ئاراستەیە لەلایەن نیشانە ئایکۆنیەکانەوە، هەر بوونی ئەم نیشانانە بوونەتە مایەی دروستبوونی پەیوندییەکی جەدەلی تر لە نێوان دەستنیشانکراوی فۆڕم و نادەستنیشانکراوی فۆڕمدا، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا، هاتوچوونێکە،(لە چوونە پێشەوە و هاتنە دواوە) یەکانگیر لە نێوان ئایکۆنی بوون و ئەبستراکتدا. ئەم ئاوێتە کردنە سەپێندراوەش هەوڵدانێکە ڕووەو بنیاتنانی جیهانێکی جوڵاو لە نێوان هەردوو لادا، لە حاڵەتی ئەبستراکتدا، سیستمە ئایکۆنیەکە ئامادە دەبێتەوە و هاوکات بە چاوێکی ئەبستراکتیانەش ئایکۆنی بوونەکانی بەرجەستە کردووە، لە هەردوو حاڵەتەکەشدا لەنێوان دوو جیهان یاخود دوو کەناردا دەبزوێت، کە کێشەیەکی بوونگەرای تایبەت پێکدەهێنن، و هەوڵدەدات بە دامەزراندنی جیهانێکی هاوشان بۆ موستەحیلیەتی ئەزمونی هەستیی، ئەمەش لە ڕێی لێکدانی ئەبستراکتبوون بە ئایکۆنی بوونەوە، ئەوەی هێنانە گۆی ئەبستراکتە بێدەنگ کردنێکی ئایکۆنی بوونە، ئەزمون و ڕوئیای هونەرمەند ئەکەوێتە ژێر چینی توێژاڵیی ئەم دووانەییەوە، دووانەییەك کە ڕەنگە چەندێ لێکدژبن (لێکدژییەك لە نێوان یەقین و دڵەڕاوکێیەکی مەعریفیی یاخود کێشەی گەڕانێك بەدوای پێوەرێکی جێگیر لە دیاردەیەکی بزۆکدا ) وەك بەرجەستەکردن و گوزارشتکردن، بەڵام لای هونەرمەند خاوەن تەباییەکی تایبەت بن. وەك (نیکۆلاس دوستائیل)دەڵێت:"ناتوانم لێکدژییەك لە نێوان هونەری ئەبستراکت و دەستنیشانکراودا/ ئایکۆنیدا/ ببینمەوە، نیگارکێشان دەبێت هەردووکیان بێت پێکەوە: ئەبستراکت بێت بەو سیفەتەی دیوارێکە، و دەستنیشانکراوە/ئایکۆنە/ بەو ئۆرت(ئیعتیبار)ەی سپەیسێك دەنوێنێ" (عرابی،أسعد: نیکولا دوستائیل والبعد النفسی لعماله الفنیه،ص١١٦).

ئامادەبوونەوەی ئەم جەدەلیەتە لێکدژە لە یەقین و دڵەڕاوکێ، لەو وتەیەی(ئەنتۆنیۆ مەچادۆ)ی شاعیریشدا (ئەی ڕێبوارەکە... ڕێگا نییە، ڕۆینە ڕێگا دروست دەکات) دەردەکەوێت، کە هونەرمەند (قەرەنی جەمیل) وەك سەردێڕێ بۆ ئاخاوتن لەسەر

پیشانگەکەی ساڵی (٢٠٠٨) لە سلێمانی/گەلەری سەردەم، بەکاری هێنابوو، لێرەدا دەبینین بوونی ڕێگا یاخود دروستکردنی، یەقینێکە (دەستنیشانکراوی/ئایکۆنی بوون)و نەبوونی یاخود نەمانی (ئینفۆرمەل/ئەبستراکت بوونە)، پێکەوە بەرجەستەی ئامادەبوونی پەیوەندییەکی جەدەلیی و هاوکات بوونی دڵەڕاوکێیەکە دەکات. هاوشانی بوون و ئامادەیی پەیوەندیە جەدەلییەکانی: بوونی هەستی شوێنکاتی و نەبوونی ، بە ئایکۆنی بوونی فۆڕم و نائایکۆنی بوونی، دەستنیشانکراوی و ئەبستراکتبوون. ئەمانە سەرجەم بونەتە هۆکاری بەدیهاتنی پەیوەندییەکی تری جەدەلی، کە ئەویش پەیوەندییەکە لە نێوان بە خاکە(خامە)کردنی فۆڕم (پرەنسیپی ڕێزگرتنی خاکە(خامە)ی کارکردن) و بە فۆڕم کردنەوەی خاکە(خامە) ی کارکردندا. ئامادەییەکانی ئەم پەیوەندیە نەبڕاوەیە وای کردووە لە هەندێ کاری هونەرییدا، بەشی دووەمی هاوکێشەکە هەژمونگەرایی خۆی پیادە بکات و دەق بۆ خۆی بکاتە پانتاییەك سەرلەبەر بۆ کاراکردنی هێزی گوتاری توانا ئیستاتیکییەکانی بەهای خاکە لە ڕەنگ و کەرەسەی تێکەڵاوی جیاوازی تر. بۆ ئەم مەبەستەش بڕوانە شێوەکانی (٥)(٦)(٧)(٨)(٩).

شێوەی ٥

شێوەی ٦

ئامادەبوونەوەی ئەم دووانەییانە سەرجەم، تێکشکاندن و تێپەڕاندنێکی ئەو حاڵەتەیە کە پێی دەوترێت (Griffe) یاخود جێگیریی و چەقبەستوویی مۆرکی هونەریی لەلای هونەرمەند. لە دواجاری دیالۆگماندا لەسەر بوونی ئەم پەیوەندییە دووانەییانە ماوەتەوە ئەوە بڵێین، ئامانج لێرەدا بەدیهێنانی نەهلستیبونێکە، کە سەرلەبەری هەر بونێکیان هەڵبوەشێنێتەوە ، لە میانی ئایکۆنی بوون بێت یاخود ئەبستراکت.
وەك ستایلی هونەریی، هونەرمەند بە ستایلی ئەبستراکت ئێکسپرێشنیزم کاری کردووە، سەرباری بوونی ئەو حاڵەتە هونەرییەی پێشتر وەك بوونی جۆرێك لەخەسڵەت و سیمای تایبەت لە کارەکانیاندا ئاماژەمان پێدا. هاوشانی ئەم جۆرە چارەسەرە تەکنیکییە، هونەرمەند لەنێو شێوازی ئەبستراکت ئێکسپرێشنیزمدا بە سەمتی سروشگەرایی (Gastrula) کاری کردووە.
وەك گوتاریی واتایی دەق، بە تایبەت لەو کارە هونەرییانەدا کە چیتر هیچ ئاماژەیەکی بەئایکۆنی بوون ئامادەیی نامێنێت، کە بەدەر لە سروشیی دیوار یا هەر پانتاییەکی کۆنی ڕیزاڵبوو، کە لێوانە بە ڕەنگی ژەنگەیەکی پیس بوو هاوکات خاکیی زەرد و ڕیزاڵبووی ئەمێستای کوردستان لە زۆربەی وەرزەکانی ساڵدا، یاخود بە هەمەکی کردنی هەر یەکەیەکی بەشەکی، شتێکی تری تیا بەدیناکرێت، جگە لە هەڵگرییەکی پڕ ئەمانەت نەبێت، بۆ وتاری خاکە(خامە)ی کارکردن، کە تیایدا خودی خاکە دەبێتە گوتاری ئاراستەکراوی دەق، واتە هەڵگێڕانەوەی پرۆسێسی باو، لە بە ئامانجکردنی ئامرازدا. کە گوتاری تەکنیکی خاکە، زاڵە تەنانەت بەسەر توانا پەخشییەکانی فۆرمیشدا، بە ئاستێ، فۆرم لەناو گوتاری تەکنیکی خاکەدا دەتوێتەوە، هەر ئەم هۆکارە مامەڵە تەکنیکییەیە وا دەکات و کردوویەتی، بە درەنگ، لە دوا دووەم جار و سێهەم جاری سەیرکردنمان، تێبینی فۆرم بکەین، وەك ئەو فۆرمە نیوە دەرکەوتووەی سەگێك هەیەتی لە بەشی خوارووی چەپی تابلۆیەکیدا. شێوەی (٩).
بەڵام لەو کارانەدا کە فۆرمە ئایکۆنیەکانی وەك (ئاسك یاخود سەگ) بەدی ئەکرێت، جا ڕاستەوخۆ بن یاخود ناڕاستەوخۆ، هەمیشە تەنهایی و بەتەنها ژیانی ئەو ئاژەڵانەمان دێنێتەوە یاد کە خۆ لە مرۆڤ

شێوەی ٧

و نزیك بوون و تێکەڵاویی بوونی، بە دوور ئەگرن لە ژینگەی هونەرمەندد‌ا، گوتاری ئەم کارانە، پەیامێکە بۆ ئاشتکردنەوەی مرۆڤ لەتەك ئاژەڵەکاندا و بە تەبایی پێکەوە ژیانیان لەیەك ژینگە و دەوروبەردا، دوای زیزکردن و دوورخستنەوەی ئەو ئاژەڵانە لەلایەن مرۆڤەوە لە کۆمەڵگەی مۆدێرنی مرۆڤایەتیدا. هەر لەم میانەشەوە هونەرمەند لە ڕەهەند گەلێکی تری واتایی دەدات، لە تەنهایی و هەستکردن بە نامۆیی و تاکڕەویی، تا دەگاتە دوورکەوتنەوە لە سروشت و لەدەستدانی جوانی و ساکاری و سادەییەکانی ژیانی بەراییانەی مرۆڤ لەنێو /لەگەڵ سروشتدا. ئەم ڕەهەندە واتاییەش خۆی لە خۆیدا لە دەستدانی لایەنە ڕۆحییەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمەیە و دواجار هەستکردنە بە نەهلستی بوون.

گوتاری دەقی بینەیی لە ستایلێکی وەك ئەبستراکت ئێکسپرێشنیزمدا، بەتایبەت لە سەمتی سروشگەرادا، توانای بەکۆدکردنێکی وا دەداتە نیشانە و ئاماژەکانی نێو بونیادی دەق، کە ئامادەیی خۆیان وەك داتاگەلێکی شارراوە بە ئاراستەی بینەر/وەرگردا پەخش بکەن، لەم سیستمە پەیوەندییە بونیادیەدا داتا شارراوەکان بێدەنگییەکی مانادار و بەئاماژە، بەڵام هاوکات خاوەن کاریگەرییەکی دیار لەسەر کۆبنیادی دەقە بینەییەکە، بەجێدێڵن. شاراوەییەکان دەبنە حاڵەتێك لە چاوەڕوانی کردن و چاودێری کردن، تا بینەر ناچاردەبێت بەشێوەیەکی کارا بەشداری بکات لە بونیادنانەوەی چەند جارەی دەقەکەدا، لەڕێی چەند گریمانە و پەیپێبردنێکەوە. ئەم چەند جارەیەی بونیادنانەوە، خۆی لە خۆیدا پرۆسێسێکە لە گەڕان و بنکۆڵ کردن(تەنقیب) لە ئارکیۆلۆژیای واتا کەڵەکەبووەکانی نێو چینەکانی بونیادی دەق. هەر ئەم پرۆسێسەشە وا دەکات توانا پەخشیەکانی گوتاری دەق، لەڕێی خۆ ئاراستەکردنە یەك لەدوا یەکەکانی چینە واتاییەکان، بەزیندویتی و کاریگەریی و بەردەوامی لەلای هونەرمەند بمێنێتەوە و گوتارێکمان ئاراستە بکات لە تەواونەبوون و بێکۆتابووندا.

شێوەی ٨

شێوەی ٩

# خوێندنەوەیەکی سیمیۆلۆژی- هێرمۆنۆتیکی بۆ بارگە سیمانتیکیەکانی ڕەنگ لەلای (قەرەنی جەمیل)

د. جەزا بەکر

**ئەم نووسینە هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەیەکی (سیمیۆلۆژی- هێرمۆنۆتیکی) کارە هونەرییەکانی هونەرمەند قەرەنی جەمیل لەچوارچێوەی تەکنیکو رەنگو ستایڵی کارکردنی هونەریدا**

**١- چاوپیاخشاندن:**
وەدیهاتووە بەرەنگێکی مەیلەو خاکی تێکسچەر زبر بونیاتنراوە، لەپێناو دەرخستنێکی تەعبیری و چاوەکی جودا. لەبەرئەوە (وەدیهێنەر) ڕوکەشە وێنەییەکەی لە میانەی بەکاربردنی ماتریاڵ و کەرەسەی تردا چارەسەر کردووە، وەکو گیراوەی قورس و خەست لەگەڵ ماتریاڵی دیکەی وەکو بزمارو خۆڵ. تاکو جۆرێك لە (خۆوەڕایی) پەیڕەو بکات. بە ئامانجی تێپەڕاندنی (دیاریکراوەکان) بەرەو (نادیاریکراوەکان).
بەمەیش نیشانە گەلێکی زۆر و جۆرەها فۆرمەڵە کراوی نامۆی لەسەر شێوەی کونیلەو چاڵی ڕەشباو، لە بەشە جیاوازەکانی سەر ڕووکەشە وێنەییەکە نەخشاندووە، ڕوخساری ئەم شوێنەوارە قووڵانەشی لە میانەی ڕەنگی تۆخ و تۆناتەکانیەوە دیاریکردووە، لەگەڵ چڕکردنەوەی پەڵە ڕەنگی سپی لە دەوروبەری لێواری ئەم شوێنەوارانەدا. بەتایبەتی شوێنەوارە گەورەکە، کە بەقەوارە گەورە دیارەکەی، سەنتەری وە دیهاتووەکەی دەنوێنێ. لەکاتێکدا شێوەیەکی کەللەسەر ئاسا، کە بەلیتە داپۆشراوە، لەنێو یەکێك لەو شوێنەوارانەدا بە دیار دەکەوێت، کە دەکەوێتە لای سەرووی چەپی ڕووکەشە وێنەییەکە.

**٢- دەستنیشانکردنی ڕواڵەتەکان:**
جوگرافیای ستاتیکی و تەعبیری ئەم وەدیهاتووە چاوەکییە، لە دوو یەکە بوونیاتنراوە. ئەوانیش (فەزا) و (نیشانەکان) ە. کە لەسەر ڕووکەشە بینەییەکە کەڵەکە بووە، بەجۆرێك (فەزای هەمەکی) وەدیهاتووەکە بووەتە بەرزی و نزمایەکی ڕەنگی کلس گرتوو، کە لە میانەی بەکاربردنی چەندین چین لە گیراوەی خەست و چڕ چارەسەر کراوە. لەکاتێکدا سستەمێکی نیشانەیی (سیمانتیکی) لەسەر جەستەی وەدیهاتووەکە بەدیدەکرێت، بەمەیش بازنە گەورە ڕەنگ تۆخەکە وەك (نیشانەیەکی دال)، لەڕێی پێکهاتە جیاوازەکەیەوە بۆتە (سەنتەری ڕوداو).
کە لێوارەکانی بە بزمار بونیاتنراوە. لەکاتێکدا لێوارەکانی ئەوبەری بەچەند پەڵەیەکی سپی داپۆشراوە، کە کردویەتیە (کۆدێکی) کارا. لەبەرئەوەی ئاماژەیەکە بۆ کۆدەکانی دیکەی دەوروبەری. وەك کەللەسەرە مرۆییەکەی کە بە ماتریاڵی نامۆ داپۆشراوە. کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کاتێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، لێرەدا بونیاتی ڕەنگەکە تایبەتمەندی تەعبیری خۆی هەیە، بەجۆرێك فۆرمی شوێنەوارو ڕەنگە پرژاوەکان دەلالەتێکی ڕەمزیان لەخۆگرتووە، وەك ئەوەی لە هەمبەر گۆڕی بەکۆمەڵدا وەستابین.
وەدیهێنەر ئەرکی دووبارە بونیاتنانەوەی ڕواڵەتەکانی بوون دەخاتە ئەستۆی (سیمانتیکای ڕەنگەکان)، بەوپێیەی کە ڕەنگەکان بۆخۆیان میکانیزمێکی هزرین بۆ گواستنەوەی سستمی وێنە (دال)، تاکو بیانگۆڕێت بە بەهایەکی سیمانتیکی وەها کە پەیوەستبێت بە (جیهانی نەمریی و تا هەتایی)، پێ بەپێی تایبەتمەندێتی تەعبیری سستمی فۆرمەڵە کردنی وەدیهاتووەکە.
وە لەم خستنە ڕووەوە دەتوانین ئەم خشتەیەی لای خوارەوە بخەینە ڕوو بۆ دیاریکردنی نیشانەکانی نێو ئەم وەدیهاتووە چاوەکییە:

**ڕەنگ:**
فەزا ڕەنگێکی خاکی نیشانەیەکی ڕەمزی/ ئاماژەکردن بۆ سروشت
شوێنەوار تۆخ نیشانەیەکی ڕەمزی/ ئاماژە بۆ ڕوداوێك
پەڵەکان سپی نیشانەیەکی ڕەمزی/ ئاماژە بۆ شوێنەوارێك

**فۆرم:**
کەڵلەسەر خاکی + سپی نیشانەیەکی ئایکۆنی/ ئاماژە بۆ مردن
بزمار کۆلاج نیشانەیەکی هاوەڵ/ ئاماژەیەکی تەعبیری

**٣- شیکارکردنی نیشانەیی:**
(نیرەر) لەم وەدیهاتووە بینەییەدا، جەختی لەسەر چۆنێتی چارەسەرکردنی ڕوکەشە وێنەییەکە کردۆتەوە، کە لەمیانی بەکاربردنی ئامرازو ماتریاڵ و تەکنیکەوە بە ئامانجی گەیاندووە، کە ئاماژە بە جۆرێك لە تەعبیری (لەخۆوەڕا) دەکات، ئەمەش بۆ خۆ دوورخستەوەیە لە بەها ئەقڵیەکان، بەجۆرێك نزیکبۆتەوە لە ستایڵێك کە ناوزەد دەکرێت بە (وێنەی دیوار)، بەو مانایەی لەیەك کاتدا پێداگری لەسەر (پێداویستیە ناوخۆییەکان) و (ڕێکەوت) کردووە. چونکە ئەو شوێنەوارەی کە لەسەر ڕوکەشە وێنەییەکە بەجێهێشتووە (وێنە) نیە، بەڵکو (ڕووداوە)، چونکە (نێرەر) ویستویەتی نواندنی ئایکۆنی و باوی شتەکان تێپەڕێنێت، لەبەرئەوە پەیوەست نەبووە بە فۆرمەوە یان ئاماژەیەکی دیاریکراوەوە، بەهەندی ئەوەی کە گرنگیداوە بە ڕەنگ و میتۆدی پەیڕەوکراو لە بەکاربردنی ڕەنگی گوزارشتخواز لە (جوڵە - ئەکشن). کە پڕیەتی لە هێزی هەڵچون و لەخۆوەڕایی، بەجۆرێك پەنای بردۆتە بەر تەکنیکی جودا. کە پشت بە دانانی چینی ئەستوور دەبەستێت لەڕێگەی بەکاربردنی گیراوەی چڕ لەگەڵ مەتریاڵی نامۆدا، تاکو دواتر چینێکی لێدەکاتەوە یان لێهەڵدەکۆڵێت بە شێوەیەکی (لەخۆڕاوە) لە میانی ئامرازێکەوە، دواتر ڕەنگە مەتریاڵی دیکەی خستبێتە سەر ڕوکەشە وێنەییەکە، کە بەهۆی بەکاربردنی ئەم تەکنیکە پێشنیار کراوەوە، لە پاشماوەی شوێنەوارێك دەچێت وەکو (دیواری دێرین) یان (زەوییەکی کاولکراو) یان گۆڕستانێکی داخوراو لەنێو لمی بیابانەکاندا، کە زەمەنێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیووە، ڕەنگە (ئاسۆی چاوەڕوانی وەرگر) ئەم ئاماژە سیمانتیکیانە بە جۆرێك لە شوێنەواری دێرین و داخوراو ڕوشاندن و هەڵکەندن

یان شوێنەواری گۆڕێکی بە کۆمەڵی پاش ڕووداوێك بخوێنێتەوە، کە بە کاریگەری سروست یان هەر شتێکیتر بێجگە لە هەندێك شوێنەوار چیدی لێنەماوەتەوە.
ئەم نەخشاندنە ڕەنگییە سیمانتیکیە پڕ ئەکشنە، وێنە داخوراوەکانی سەر دیواری هەندێك لە ئەشکەوتەکانی قۆناغی بەردینی نوێمان وەبیردێنێتەوە سەرباری ئەوانەش (نێرەر) لە میانی کاراکردنی گیراوە سپیەکەوە جەختی لەسەر لێواری ئەو شوێنەوارانە کردۆتەوە، تاکو بەها تەعبیری و چاوەکیەکانی کاریگەرتر بکات، و وا لە (ئاسۆی چاوەڕوانی وەرگر) دەکات کە بەشوێنەواری ڕوداوێکی کیمیاوی لەسەر جەستەی سروشت بێتە بەرچاوی، ڕەنگە بەهای بنەڕەتی و سیمانتیکی ڕەنگ لە نێو کۆی ئەم وەدیهاتووەدا ئەوە بێت کە جەخت لەسەر هەڵچوونە ڕاستەوخۆ نادیاریکراوەکان بکاتەوە، بە مەبەستی نزیکبونەوە لە حاڵەتەکانی ئەودیو (فۆڕمە)وە. نادیاریکراوی و دورکەوتنەوە لە هەر(فۆڕمگەراییەك)، کە پێویستی بە خێرایی جێبەجێکردن و وەشاندنی پەڕەمووچ هەیە، بۆتە هۆی بەدیهێنانی جۆرێك لە تێکەڵاوی و ئاڵۆزی بینەیی، بەو پێیەی (نێرەر) هەر خۆ بەستنەوەیەك بەشتە (دیارو ئایکۆنیەکانەوە) یان (هەر بیرۆکەیەکی پێشوەختەوە) ڕەتدەکاتەوە. بەڵکو زیاتر خۆی داوەتە دەست خەسڵەتەکانی (ئەکشن) و (سیمانتیکای ماتریاڵ و ڕەنگەکان).
وەدیهێنەر. لە میانی خەسڵەتەکانی (بێ فۆڕم، ئەکشن، لە خۆوەڕایی) بەرەو ڕەهەندێکی بێکۆتاییمان دەبات، کە خۆ دەئاخنێتە نێو ڕێبازەکانی (پۆست مۆدێرنە)وە، بەتایبەتیتر (ئەبستراکت ئێکسپرێشنیزم)و تێزە بوێرەکانیەوە، بە مەبەستی کاراکردنی ڕوکەشێکی بینەیی بزۆك، بەجۆرێك کە خۆ لە وێناکردنی باو بەدوور بگرێت، بەڵکو پێشەنگی دەداتە بەکاربردنی هەموو ئامرازێکی دیکەی وەکو وەشاندنی خێرا و ماتریاڵی نامۆو چڕو ئەستوور. وەدیهێنەر دەیەوێت ژیانێکی بینەیی تایبەت ببەخشێتە ڕووکەشە وێنەییەکە، بە ئامانجی ئازادکردنی وزەی سیمانتیکی ڕەنگەکان ئەمەیش لەڕێگەی چڕکردنەوەیەتی، ڕەنگ وەکو کردەیەکی ئەکشن و بزۆك بووەتە ناوەڕۆکی (بابەتی سەرەکی) ڕوکەشە بینەییەکە، کە گەلێك بەهای سیمانتیکی لێکەوتۆتەوە، کە پەیوەستە بە جووڵەو کەڵەکە بوونی چینە ڕەنگیەکان لەنێو بونیادی فۆڕمەڵە کراوی وەدیهاتووەکە.
ئەم خەسڵەتە، سیمانتیکیە بینەییانە وای لە (نێرەر) کردووە کە بە ئاوایەکی ئاڵۆزو سستمێکی دژوار مامەڵە لەتەك وێنا زهنیەکانی خۆیدا بکات، کە زیاتر پشت بەستە بە(نەست) وەك بزوێنەرێکی بنەڕەتی بۆ فۆرمەڵە کردنی وێنە سیمانتیکیەکانی، کە لەوانەیە لە ئاسۆی چاوەڕوانی وەرگردا، وەکو کەللەسەرێك یان شوێنەواری ڕوشاندنێك یان هەر شتێکی دیکە خۆ بنوێنێت. بەڵام بەکاربردنی ئەم ئاماژانە لەسەر ڕوکەشە وێنەییەکە پێداویستیەکی ناوەخۆی خودی (وەدیهێنەرن)، بەپێی گۆڕاندنی نواندنە ئایکۆنیەکان بەرەو نێوکۆی ئەبستراکت، لە پێناو تێکدانی سستمە باوەکان و کردنەوەی ئاماژەکانی ڕەنگ وەك بونیادێك بۆ هێرمۆنۆتیکایەکی کراوە، یەکێك لە ئەگەرە هێرمۆنۆتیکیەکان بۆ خوێندنەوەی کۆدە سیمیۆلۆژیەکان وەك شوێنەوارو بزمارو ڕژاوە سپیەکان لەسەر ڕوکەشە بینەییەکەو سەرجەم ئاماژەکانی نێو ئەم جوگرافیا داخوراوە، لەو ئەشکەوتانە دەچێت کە بونەتە جێ نزرگەی ڕۆحەکان.

بەمەیش سیمانتیکای ڕەنگەکان چێژی یاریکردن و دۆزینەوەو ئازادی ڕاڤەکردن (هێرمۆنۆتیك) دەبەخشێتە وەرگر، پەخشکردنەوەی ڕەنگە پرژاوەکان لەنێو ئەم وەدیهاتووەدا، کە بواری قوتاربوونی لە کۆت و بەندی عەقڵانیەت دراوەتێ، ڕێگای خۆی لەنێو (کەینونەی ڕەنگدا) دەبینێتەوە، بەهۆی بزاڤی ناوخۆی ڕەنگ و ماتریاڵە خەستەکان. وا دەخوازێت کە وەدیهێنەر بەهاکەی لەنێو بونیادی ڕوکەشە وێنەییەکە وەکو کێڵگەیەك لە خۆڵ و زەوی سووتاو دیاریبکات، وەك ئەوەی کە گوتاری ڕوکەشە بینەییەکە لە ئاماژە گشتگیرەکەیدا بریتیە لە (سروشت). بەواتای پێداویستی گەڕانەوە بۆ شێواندن و پەخشکردنەوەی ئازادانەی (دالەکان) و داپۆشینی ڕوکەشە بینەییەکە بە ماتریاڵی نامۆ، جۆرێکە لە دۆزینەوەی پەیوەندی هونەری لە نێوان (ڕەنگ/ ماتریاڵ).
گوتارە هونەرییەکە، دەمانباتەوە بۆ مێژوویەکی دێرینی سەرەتاکانی دروستبوونی گوندە کشتوکاڵیەکانی کوردستان، کە ڕەنگە ئەمە بۆ خۆی ئاماژەیەك بێت بۆ پەیوەندی مرۆڤی کورد بە خاکەکەیەوە، بەجۆرێك بیرۆکەی بە پیرۆز گرتنی هێزە میتافیزیکیەکانی لێدەخوێنرێتەوە، ئەو هەموو شتێك لە سروشت دەخوازێت لەپێناو ئەزموونە بینەییەکانیدا، ناوەستێت و ئەزموونەکانی لە میانی بەکاربردنی ماتریاڵی نامۆوە بەردەوامن بۆ ئافەریدەکردنی ڕوکەشێکی هونەری.
بەمەیش چەمکگەلێکی جودای لە دیدگاو ئەزموونەکانیدا پەیڕەو کردووە، کە ڕەهەندێکە بەرفراوانی بەخشیوەتە چەمکەکانی لە پێناو تێپەڕاندنی تەکنیکە باوەکان لە نێو گوتارە هونەریەکەیدا. ئەم ڕیزبەندیە بوێرانە ناعەقڵانیە فۆڕمەڵە کردنی ڕوکەشە وێنەییەکەی بەرەو کردنەوەیەکی سیمانتیکی وەها بردووە، کە بارگە سیمانتیکیەکانی ڕەنگ تیایدا تا ئەو پەڕی توانا دەتەقێنەوە:

لەبەرئەوە تێگەیشتنمان لە وێنەو ڕەنگەکانی نێو بونیادە بینەییەکە، بە خوێندنەوەی (ناوخۆی) تێکستە هونەریەکە دێتە دی، تاکو هەژموونە دەرەکیەکان بدۆزینەوە. ئەو هۆگر بووە بە بەکاربردنی گیراوەی خەست و ڕەنگەکان و بارگاویکردنیانی بە ئاماژە سیمبولیەکان وەك تەعبیرێك کە زیاتر دەرهاویشتەی ستاتیکای نیگارکێشانی پۆست مۆدێرنەیە. لەبەرئەوە پێویستە ڕاڤەی مەدلولەکانی ڕەنگ بکەین، کە ڕەنگە بیرۆکەی بەکاربردنی ڕەنگەکان بە ئاماژەیەکی هزری پەیوەست بێت بەو گوتارە شێوەکاریانەی کە ئاڕاستەی جیهانی (ڕەها) کراوە.
کە هەژموونی هەیە بەسەر ڕووداوە گەردونیەکاندا بەهەموو دیاردەکانیەوە. کە ڕەنگە هەندێك وێکچوو لەنێوان گوتاری تەکنیکی ئەم وەدیهاتووەو گرووپی (بارمتەکان)ی هونەرمەند (فۆتریە) دا ببینینەوە، کە تەکنیکێکی تایبەتی پەیڕەو دەکرد ئەویش تەکنیکی بەکاربردنی (گیراوەی خەستە).
لەبەردەم ئیشکالیەتی کردنەوەی کۆدی ڕاڤە کردن لەنێو ئەم وەدهاتووەدا. پێویستە لە سستمی سیمانتیکی ڕەنگە سپی و بزمارەکان و شوێنەوارەکانی دیکەی بکەین.
بەتایبەتی بونیادی ژێرەوەی تێکستەکە، کە ئاماژەیەکن بۆ وەزیفەی ئەم نیشانە ڕەنگیانە، بەوپێیەی کە ئەم نیشانانە هەژمونیان هەیە لەسەر ڕوکەشە وێنەییەکە، ئەمە بێجگە لەوەی کە بونیادی ژێرەوەی تێکستەکە، ئاماژە دەدات بە پەیوەندی نێوان ڕەنگی سپی و ڕووداوە بە ئازارەکان، ئەگەر هاتوو کارامایی ئاماژە سپیەکان و مەدلولە ژێدەریەکانی لەبەرچاو بگرین، لەوانەیە یەکێك لە خوێندنەوە سیمانتیکیەکان بریتیبێت لەوەی کە بیرۆکەی ئەم وەدیهاتووە ڕەنگە پەیوەستبێت بە ڕوداوی لەناوبردنی بە کۆمەڵ، بەهۆی شتێکی ترسناکەوە کە مەدلوولە هزریەکانی کاریگەری و نەخشی خۆیان لە ئاسۆی چاوەڕوانی وەدیهێنەردا دانابێت.

# قەرەنی جەمیل
# ڕۆح بە بەر قوڕدا دەکاتەوە

دەسپێك دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە من ڕەخنەگری پلاستیکی نیم و ئەم چەند دێڕەی کە لێرەش دەینووسم چەند ئینتیباعێکە لەسەر ئەو تابلۆیانەی کە لە ماڵپەڕی گەلەری زاموا چاوم پێکەتوون و سەرجەم بەرهەمەکانی قەرەنی ناگرێتەوە. نە دەتوانم بچمە مێژووی ئەو تابلۆیانەوە، نە دەشتوانم لە تیۆرییەکی پلاستیکی دیاریکراویشەوە، لە شیکل و ڕەنگ و پانتاییەکان بدوێم. بەڵام خاڵی جەوهەری ئەوەیە کە قەرەنی جەمیل خاوەن هەستێکی باڵایە لە ئاویتەکردنی هەست و بەرجەستەکردنی لە جیهانێکدا کە لە نێوەند سنوورەکانی ئەپستراکت و فیگەردایە.

کاتێك باسی ستایل و شێوازی هونەرمەندێکی دیاریکراو دەکرێت، باس لە ڕەنگ دەکرێت، گواستنەوەی ڕەنگ لە توخمێکی گشتییەوە بۆ بە تاککردنی و تایبەتمەندی پێدانێکی وا، کە لە ڕێگەیەوە هونەرمەندی پێ بناسرێتەوە. ڕەنگ لای قەرەنی تەڵخیی قوڕی هەیە، مێژووی قوڕ لە میزۆپۆتامیا تێکەڵ بە نووسین دەبێت، بەڵکو دەبێتە پەڕتووك و پەڕاو کە ئینسان مێژووی خۆی لە سەر تۆمار دەکات. قوڕ بەشێکی زۆری فەزای ئێمەی دروستکردووە. لە گەرمیانەوە تا دەشتاییەکانی دزەیی، ڕەنگ و ڕەگەزی خۆڵ، هەمیشە ئینسانەکانی بەرەو ڕووی چارەنووسی خودی خۆیان بوونەتەوە. هەر لە دروستکردنی خانوو و سەکۆوە بۆ سەرخەرمانەکان کە ڕەنگی گەنم و خۆڵ بە جۆرێك تێکەڵ دەبن کە هەنووکەیی دەست لە مل ئەبەدییەت دەکات. لێرەوە قەرەنی بەو ڕەنگانە قووڵاییەك دروست دەکات کە هەست دەکەیت هەر پانتاییەك چەندین ڕەهەندی لێوە دروست دەبن.

ڕەنگی سپی و ڕەشیش دێن هەندەی دیکە قووڵایی دەبەخشنە پانتاییەکان، بە ئاستەم، فیگەرێك پەیدا دەبێت، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی پێمان بڵێت لێرە ئینسانیش هەیە کە شیکلی وەرنەگرتووە، یا شیکل و ڕووخسارەکانی سڕاونەتەوە، یا زیندەبەچاڵ کراون، ئاماژەیەکی پەنهانیشە بۆ گۆڕە بە کۆمەڵەکان، کە کاتێك ئینسانێکی کورد هەنگاو دەنێت، دڵی دەکەوێتە خوریە و خەتەرەیەك ڕۆحی دادەگیرسێنێت: بە ئاستەم پێ بەسەر زەمیندا بنێ، ڕەنگە گۆڕێك لە ژێر پێتدا هەبێت! لە هەندێ شوێن شیکلی پەنجەرەیەك دەبینین، پەنجەرەیەکە بەڵام نەبووەتە پەیوەستێك لە نێوان دەرەوە و ناوەوە، نەبووەتە ئەڵقەیەك دەرەوە بە ناوەوە ببەستێتەوە، بەڵکو تەنها شیکلێکە، دێت و دووری دەداتە تابلۆ و لە ڕەتابەت ڕزگاری دەکات. لە هەندێ شوێنیش چەند قەوانێك، عەففوییانە فڕێدراون و کە یەکسەر پێمان دەڵێت ئێمە لە سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیستویەکەمدا دەژین. قەوانێك ئەگەر ئاماژەیەکی لاوەکی بۆ چەك بکات، بەڵام مێژووی هەموو تراژیدیاکانمان دەهێنێتە زمان.

لە ڕێگەی خۆڵ و قوڕ و کەوان و پەنجەرە و قەوان و ئاژەڵێك یا سیسارکە کەچەڵێك، مێژوویەك بەرجەستە دەکات، بەڵام بە زمانی ئاماژە، ئاماژەیەکی تا بڵێی ناوەکی و پەنهان، سەمبۆل نین، بەڵکو وەکو بروسکە زیارەتمان دەکەن. مێژوو و حەکایەتمان بۆ ناگێڕنەوە، بەڵام وەکو نەقیزە جیهانێکمان لە نێو هزر و یادەوەری و زاکیرەدا دەبووژێنێتەوە کە ئەرکی هونەری هاوچەرخ دەگەیەنێتە ئاستە هەرە باڵاکانی.

قەرەنی جەمیل وەکو شاعیر مامەڵە دەکات، یاوەکو مۆسیقاژەنێك، بە وردی، زۆر بە وردی مامەڵە لەگەڵ توخمەکان دەکات. هەموو ڕەگەزێك لە ماددیەتی ڕزگار دەکات و نەفەس و ڕۆحی دەکاتە بەر. بەرجەستەیەك، گرێیەك، ساتمەیەك، ڕەنگێکی تایبەت، دووریی و مەنزوورێك، لە کۆتاییدا، هەموو شتێك لە پێش بینینی هونەرمەندا لە دایکبووەتەوە... بیرمان بۆ ئەفسانەیەکی دێرین ڕادەکێشێت... تەیرێك لە قوڕ دروست دەکرێت و هونەرمەندیش دێت فووی پێدا دەکات و لە پێش چاومان باڵ دەگرێت و فەزامان لە لا فراوان دەکات.... ڕەنگە ئەو پەڕەسێلکانە بن کە هاوسەنگی جیهان بپارێزن...

# کوشتنی ئامانژە باوەکان لە تابلۆیەکی هونەرمەند (قەرەنی جەمیل )دا

## دەستپێك:

ئەم توانستە نەبینراوانەی کە دەبێتە پاڵنەرێکی جەوهەری (الدافع الجوهری) بۆ ڕاڤەکردن و پرۆسەی شیکردنەوەی هەر کارێکی هونەریی بە گشتی و هونەری وێنەکێشان بەتایبەتی، بەڕوویەکدا ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ خودی کەسێتی ڕاڤەکار «مفسر» کە لە ئاست ئەو کارەی شیکردنەوەی بۆ دەکات لە ئان و چرکەساتی بەرکەوتنیدا تووشی شۆك دەبێت و ئاوێتەی کۆی ئەتمۆسفێرەکەی دەکات و گەشتێکی بینین دەکات بە نێو سەرجەم ئاماژە دیارەکانیداو لەوێڕا کەشفی مانا و دەلالییە نادیارەکانی دەکات، ئەو کاتەی لەو تەلیسمە سیحراوییە قوتاری دەبێت، بێ سێ و دوو، لە هۆکاری جەوهەری ئەو کێشکردن و ئاوێتە بوونە سیحراوییە ناسروشتی و ناباوەی بێ ویستی خۆی دەکۆڵێتەوە، ئەم قۆناغەش بە قۆناغی دەرککردن بە کۆدێکی (شیفرە ) ــ **Code** ــ داخراو دەداتە کەسێتی ڕاڤەکار ــ بینەر، دوا بەدوای ئەم دەرککردنە بە بوونی کۆدێك پرۆسەی ڕاڤەکردن پیادە دەبێت، بۆیە ( پێرس ) گوتەنی (کە یەکێکە لەو جەمسەرە سەرەکیانەی بیریارانی میتۆدی ئاماژەگەری و بە پێشەوای ئەم میتۆدە دادەنرێت لەتەك دوو ( دوسێسیردا ) لە بەرامبەر هەر دەقێکی ڕاڤەکاریدا دەستنیشانی ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرەی کردووەو دەڵێ ( ئەگەر کۆد ــ شیفرە ــ **Code** ــ بوونی نەبێت ڕاڤەکردنیش نابێت، دیارە دەبێت ئەوەش بخرێتە ڕوو سەبارەت بە ڕاڤەکردنی کاری هونەری پەیوەستە بە خودی ڕاڤەکارەوە ئەمە لەو ڕووەوە کە کاری هونەری یان دەقی داهێنەرانە (بەرهەمێکی کراوەیە) بە مانا ئەمیرتۆتیکۆییەکەی واتە بە پێی دنیابینی ڕاڤەکارانی شیکەرەوە ئەم مانایانە هەڵدەگرێت تا دەگاتە ڕادەیەك لە دواجاردا شتێك نامێنێت دەربارەی واتاو مانای کاری هونەری کە پێی بوترێت ( دواهەمین حەقیقەتی مانای کاری هونەری . یان دەق ) ئەمەش ئەو ڕاڤە یەك لەدوا یەکانەی کە بۆ کارە هونەریەکان دەکرێت ئەو ڕاستییە خراوەتە ڕوو گەر کۆنترین کارێك بە هەند وەربگرین بۆ ئەم مەبەستە کە هونەری ئەشکەوتە **Cave art** هەر لە سەرەتای دۆزینەوەیان و بە ئەرشیف کردنیان لە کەتالۆك و پاراستنیان بیریار و ڕەخنەگرانی بوارە جیاجیاکان کردیانە بابەتگەلێکی ئەوتۆ تا تیۆری و میتۆدەکانی لەسەر بسەلمێنن، لەم ڕوانگەیەشەوە کە باسەکەی ئێمەی هاتە سەر ئەم خاڵە دەتوانین بڵێین کە هەر ڕاڤەکارێك بەو جۆرە لێکیان دەداتەوە کە یەکدەگرێتەوە لە گەڵ میتۆدی دراسەکەی، بۆیە تا ئێستا بە لێشاو تێڕوانین و لێکدانەوەی جۆراو جۆری بەدوای خۆیدا بەرهەم هێناوە و ئەم پرۆسەیە بەردەوامی وەردەگرێت و ئەم خاڵەشە کە زەمەنی هونەر ئەبەدییە و ناکۆتایە تا بونیادەم ژیان بکات ئەو کارانەی کە لە قۆناغە مێژوویەکاندا بەرهەم هاتوون شیفرەی نوێی لێ هەڵدەهێنجرێت، کەشفی نوێ بە دوای خۆیدا دەخرێتە ڕوو، وەك کارێکی هونەری کراوە. لەبەرچاو دەگیرێت مەبەستم لە نەمری و ئەبەدیەتی ژیانی کاری هونەری لەسەر کاری هونەری داهێنەرانەیە و هەڵگری خەسڵەتگەلێکە کە مەودای زەمەنی فیزیکی دەبەزێنێ و مەودایەکی نەمریی و ئەبەدیەتی بەباڵایدا دەبڕێ.

**شیکاری ئاماژەگەریانەی تابلۆکە:**

لێدوانەکانمان بە ئاماژە ئایکۆنیەکان دەستپێدەکەین سەبارەت بەم تابلۆیەی هونەرمەندی نیگارکێش ( قەرەنی جەمیل )، بڕوانە تابلۆکە لە خستنە ڕووی کۆی ئەو ئاماژانەوە کە زۆربەی زۆریان لە دیمەنێکی سروشتی – دەشتێکی کاکی بە کاکی و لە زەمەنی خۆرئاوابوون سەرچاوە دەگرن، دیارە شیکردنەوەکە وا پێویست دەکات بە چەند هەنگاوێك ئەم کارە ئەنجام بدەین:

هەنگاوی یەکەم: لە ڕووی چۆنیەتی ( نوعیە ) سەرجەم ئاماژە ئایکۆنیەکانی تابلۆکە لە خۆی گرتوون، نیشانە گەلێکی خولّقێنراوی دوالیزمی نیشانەی بارو نیشانەی ئەبستراکت تەعبیرین لە دیمەنێکی سروشتیدا، ئەگەرچی تا ڕادەیەکی ئەوتۆ زۆربەی پانتایی ڕووبەری تابلۆکە ئەم کردە دوالیزمییەی لە ئاماژەکاندا دەبینرێت، بەڵام وەك ئەوەی لە تابلۆکەدا دێتە بەرچاو، بە یەکسانی ئەم چۆنیەتی ئاماژە گەلە لە ڕووی تابلۆکەی نەگرتۆتەوە، بەڵکو لە نێوان ئاماژە خولقێنراوەکان کە سەرچاوەکەیان – مرجع – دەچنەوە سەر دونیای دەوروبەرو دیمەنی وێنەی ئایکۆنی سەگێك بە کردەی ئەبستراکت تەعبیریدا تێپەڕە بووە، ئەم نیشانەگەرییە تا ڕادەیەکی زۆر بۆ بەشی باکگراوندی تابلۆکە و تا نیوەی سەرەوەی گرتۆتەوە، تا دەگاتە بەشی فۆرگراوند کە لەو پانتاییەدا هونەرمەند ئاماژە گەلێکی دابڕاو ( قطعیە العلاماتیە ) لە سەرچاوەگەرییەکی – واتە – مرجعیە – کە واقیعی خولقاندووە وەکو کە دەبینرێت یەکپارچە بەدەرخستن و دەربڕینی ڕووداوێکی سایکۆلۆژی و ڕۆحی لێوان لێو

لە شپرزەیی و نیگەرانی بەبێ ئەوەی مانایەکی زەینی بداتە دەرەوە دەنوێنێ، ئەگەرچی لە سیاقی گشتی تابلۆکەدا ئەو لێدانی فڵچە و تورەیی و شپرزەییەی کە ئەکریلکی سپی شل وەشێنراوەتە سەر ملمسی ساری ئامادەکراوی پێشوەخت بە ماتەریالی جۆراوجۆر، کە بەرز و نزمی پانتاییەکە ئەوەندەی تر بووە جێی کاریگەر بۆ دەرخستنی ئەو ڕووداوە سایکۆلۆژیە، دروست ئەو سپێتییەی لە نێوەڕاستی فۆرگراونداو بە پێی سیاقی سایکۆکە ئیحای ئێسك و پروسکی بوونەوەرێك دەداتە بینەرانی، بەو پێیەی دیمەنە ئایکۆنییە تەعبیریە تەجریدییەکەی سەگە واق ورماوەکە و بە چەند هێڵێك وەك ڕێگە بێت بەرەو ئەو ڕووداوە ئاماژەکراوە، وەك چۆن بە هەمان هێڵی کێرف **CERVE** کەوانەی دیمەنی باکگراوندی تابلۆکە بەستراوەتەوە بە بەشی نێوەڕاستی تابلۆکە، بەهۆی ئەو هێڵە کەوانەییەی کە وەك ڕێگایەك ئاماژە دەدات. ئەوەی زیاتر ئەم تابلۆیەی کردۆتە جێی سەرنج و بینەر ناتوانێت بە لایدا تێپەڕێت و لە کاریگەری بۆ سەر پەردە هەرە قووڵە تەنکەکانی هەست و نەستی نەکات، لەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو ئاماژە خولقێنراوە مطیعیە لە فۆرگراوندو دروست لە نێوەڕاست ئەم کردەیە پیادە کراوە و بە یەکەمین خاڵی پێرسپێکتیڤی بینەر لەخۆ دەگرێ. تا ئێرە مەبەستمان بوو ڕوونکردنەوەی پلە بە پلەی — تدرجی — ئاماژەکان لە باکگراوندەوە کە یەکەمیان شانسی کەمترین ڕووبەری پێ براوە ئاسمانە، دوابەدواو هێڵی سنووری ئاسۆی خۆرئاوابوون و تا ئێرە زیاتر لەهەر ئاماژەیەکیان ئەم بەشانە سەرچاوەیان دەچنەوە سەر سروشت، بەڵام بە کردەیەکی ئەبستراکت تەعبیریدا تیکراوە و لە ناوەڕاستەوە بە دوو هێڵی ڕەساسی تۆخ ڕێگەیەك بە پێی ئاسۆ دیمەنەکەی ناوەڕاست کە ئایکۆنی سەگەکەی تێدایە بە یەکەوە بەستۆتەوە، وەك پێشتر تا ڕادەیەك ئاماژەمان پێدا، دووەم هێڵی باو و تەعبیری تەجریدی ئاوانە دوانەیی — دوالیزمی تا دەگاتە لای ئایکۆنی سەگەکە، لەوێوە بە هێڵێکی تا ڕادەیەك وەك هەڵکەنرابێت وەهایە لە شێوەی پیتی **S** لە دیدی سەگەکەوە بەرەو ئاماژە خولقێنراوەکەی فۆرگراوند، کە پێشتر لێی دووایـن، کێشراوە بەو واتایەی کە تێڕامانێکی قووڵ لە سەگەکەوە دەرك پێدەکرێت، بەرامبەر ئەو ئێسك و پروسکەی کە تەنها لە سیاقی کۆی تابلۆکە دەتوانرێت ئەو ئاماژەیە هەڵگری مانای ئێسك و پروسك بێت، ئەمەش دەلالەتی تێڕامان لە مەرگ دەدات. لەو ئەتمۆسفێرە غەمگینەدا کە وەك سروتێك دێتە پێش چاو، لە ڕووی ڕەنگەوە ئەگەر بڵێین ڕەنگ کۆی تابلۆکە هەڵگری ئاماژەکانی بێدەنگییە، چونکە ڕەنگێك باڵی کێشاوە بەسەر کۆی تابلۆکە کە ئۆکەرێکی سەوزباوی مردووە، یان بە پێچەوانەوە، سەوزێکی ئۆکەری بارگاوی بە غەم و نادیاری، ئەوەشی کە تاریك و ڕووناکی **SHADO AND LAGHT** یە، ئەوا بەشی ناوەڕاستی تابلۆکە نەبێت کە ڕووناکی خراوەتە سەر، دوو بەشەکەی دی هێڵە سنووری فۆرگراوندەکە پلەی تۆنی سەوزەکە تێرو تاریکتر دەنوێنێت و لە فۆرگراوندیشدا لەگەڵ بەکارهێنانی مادەی جۆراوجۆر، کە لە ڕووی قووڵیی بەخشییەکەی بۆ کۆی تابلۆکە و هەم بۆ ئەو دەربڕینەی کە خولقاندنی ئاماژە گەلێکی بارگاوی بە سایکۆلۆژی کێشکردنەکانی بینین بۆ سەر ئەو بەشە جەوهەرییەی کە هونەرمەند مەبەستی بووە، یان بە مانایەکی تر: مۆتیڤی سەرەکی بەرهەمهێنانی ئەم تابلۆیە لە پێناو ئەو بەشەدا بووە و تا ڕادەیەکی زۆر ئامانجەکە پێکراوە. بۆیە ئەتوانم ئەوە بڵێم گەر ئەو تابلۆ داهێنەرە نەبوایە ئەم دەقە ڕەخنەییەش بەرهەم نەدەهات.

# قەرەنی جەمیل:
# باوەڕناکەم هونەری مۆدێرن لە وڵاتێکی وەکو ئێمەدا هەبێت

گەر بەوردی بڕوانینە هونەری شێوەکاری لە شاری هەولێردا، بێگومان یەکێك لەو شێوەکارانەی کە ئەمڕۆ پانتاییەکی فراوانی هەیە و توانیوێتی لەچەند هەوڵێکی جیاوازدا کار بۆ هونەری شێوەکاری بکات هونەرمەند (قەرەنی جەمیل)ە، کە وەك مامۆستایەك و خاوەن ئەزموونێك توانیویەتی گۆڕانکارییەك ئەنجام بدات، ئێمەش بەمەبەستی سازدانی گفتوگۆیەك لەگەڵ هونەرمەند، سەردانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی هەولێرمان کرد و ئەم گفتوگۆیەمان لەگەڵدا سازکرد.

هونەرمەند ساڵی (١٩٥٤) لەشاری هەولێر لەدایکبووە و ساڵی (١٩٧٧) دبلۆمی لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەرگرتووە و خاوەنی چەندین پێشانگەی تایبەت و هاوبەشە لە (هەولێر، بەغداد، فلۆرەنسا، بەرشەلۆنە، ئەلونێکەر، ڤالێنسیا، بڕۆکسل، کۆبنهاگن، ئایاسلستاین).

دیمانە: بەختیار سەعید

قەرەنی جەمیل

***پێناساندنی نیگارکێشە کوردەکان لەنزیکەوە بەخوێندکاران چەندە هۆکارە بۆ تێگەیاندنی هەستی نیگارکێشی لەلای خوێندکار تاکو هاندەر بێت کەکاری نیگارکێشی بکات؟**

-من لەو بڕوایەدام شتێکی گرنگە گەر بێتو ناساندنی هونەرمەندانی کورد، ئەوانەی کە لە مێژووی هونەری کوردیدان بە خوێندکارانی پەیمانگە و بەخەڵکی شتێکی گرنگە، ئەوەش دەکرێت لە پەیمانگەکان زیاتر لەوانەی مێژووی هونەر بابەتێك هەبێت لەو بارەیەوە لەهەمان کاتیشدا کۆڕ ببەسترێت و سلایدی ئەو هونەرمەندانە نمایش بکرێت و باس لەو هونەرمەندانە بکرێت، واتا مەرج نییە باس لە یەك هونەرمەند بکرێت، هەروەها بەنمایش کردنی سلایدەکان و باسکردنی هونەرمەندانی پێش خۆیان دەبینین، ئەو هونەرمەندانەی کەساڵەهای ساڵ کاریانکردووە، چۆن کاریان کردووە، ئەو قۆناغە ئەکادیمییانەی کە ئەوان تێیدا بوون، ئەوانە نمایش بکرێن لە پەیمانگە کارێکی گرنگە و پێویستیشە بکرێت، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێندکارانی پەیمانگە هانبدرێت تاکو لەسەر بنەمایەکی جدی کاربکەن و تەماشای ڕابووردووی خۆیان بکەن وەکو هونەرمەندێك.

***لە پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی بەغدا کێبوون لەو نیگارکێشە کوردانەی کە لەگەڵتا بوون؟**

-کۆمەڵێکی زۆر باش کە ئێستا هەموویان هونەرمەندی سەرکەوتوون لەوانە دەتوانم بڵێم (سمکۆ تۆفیق) ئەو لە قۆناغی سێیەم بوو کە ئێمە چووینە پەیمانگە، هەروەها (لالە عەبدە) خوێندنی تەواو کردبوو، هەروەها لە هونەرمەندە باشەکان(جەلال ڕەووف، ئازاد نانەکەلی) کۆمەڵێکی زۆر باش بوون کە ئێستا زۆربەیان لە دەرەوەن کە خاوەنی کاری پوختەن و پێشانگەی زۆر باش دەکەنەوە و خوێندنی باشیان خوێندووە.

***بەکارهێنانی یەک جۆر ماتڕیاڵ لەلای هونەرمەند هۆکارە بۆ پسپۆڕی لەو بوارەدا یاخود هۆکارە بۆ دواخستنی هونەرمەند؟**

-وابزانم ئەوە نە هۆکارە بۆ پسپۆڕی نە بۆ دواخستن، چونکە وەك هونەرمەندی شێوەکار باشترە دەست بۆ هەموو جۆرە ماتڕیاڵێك درێژ بکات، پێویستە بۆ ئەوەی ئەزموونی هونەری پتەوتر بێت ئەو بوارە فراوانە بقۆزێتەوە، کە زۆر کەرەستە دەگرێتەوە، زۆر مادەی هەمە جۆر هەیە، بۆنمونە ڕەنگی ئاوی، یان ڕەنگی زەیتی و ئەکریلیك، کەرەستەی هەمە جۆر هەیە لەمڕۆدایە، لەم سەردەمەدا زۆر کەرەستە و ماددەی هەمەجۆر دروست بووە کە پێشتر هەربوونی نەبووە، گەر هونەرمەند سەرقاڵی یەك کەرەستە بێت، ئەمە هەژاری تەکنیك و هەژاری ئەزموونی دەگرێتەوە نەك پسپۆڕی و دواکەوتوویی.

***سەردەم چەند هۆکارە بۆ دەست نیشانکردنی جۆری کارو جۆری ماتڕیاڵ لەلای هونەرمەند؟**

-ماتڕیاڵی هونەری، یاخود هونەرمەند پەیوەندی نییە بەو قۆناغانەوە، بەو سەردەمانەوە، واتا ماتڕیاڵێك هەیە ئسلوبێك هەیە کە ئەو هونەرمەندە بەکاری دەهێنێت ئەو کەرەستانەی کە بەکاری دەهێنێت ئەوەندەیە هونەرمەندەکە ناوەڕۆکەکەی دەگۆڕێت، ئەویش سەربەستە لەو حاڵەتە، زۆر جاریش هەیە کۆمەڵگە قۆناغێکی زۆر ناخۆشی هەیە، یاخود جەنگە ئەوە هونەرمەندە ناڕوات بۆ بابەتی جەنگ و بابەتی تراجیدی و دراماتیکی، دەکات بەپێچەوانەوە و دەچێت بەرەو بابەتی خۆشەویستی و هێمنی و شتی جوان، جاریش هەیە بەپێچەوانەوە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆسەر بیرو بۆچوونی هونەرمەندەکە وەکو ڕووئیایەکی هونەری، گەر ئەو هونەرمەندە خاوەنی ڕووئیایەکی جێگیر بێت، ئەوا لەگشت سەردەمێکدا ئەوە بیروبۆچوونی خۆی هەیە، هەر بۆیە لەو بڕوایەدانیم سەردەم ڕۆڵێکی ئەوتۆی هەبێت

لەبەکارهێنانی کەرەستە و مادە، گرنگ بابەتە، بابەتی ناوەڕۆك چۆن ئەو بابەتی ناوەڕۆکە نیشان دەدەیت، مەرج نییە کە کۆمەڵگە لەحاڵەتی درامادا بژی، دەبێت هەموو هونەر دراماتیکی بێت، یاخود کە کۆمەڵگە لە ژیانێکی هێمن و خۆشیدا دەژین دەبێت هەموو هونەرمەندان سەرقاڵی گوڵ و گوڵزار و بابەتی سادەو بێ ناوەڕۆکی دراماتیکی بن، ڕەنگە هەندێ کات پەیوەندی بە حاڵەتی مەزاجی و دەروونی هونەرمەندەکەوە هەبێت لەوەی بەواقیعی کۆمەڵگەکەوە.

***زۆر هونەرمەندی جیهانی هەیە کە گرنگی بەپۆرترێت داوە، یاخود کردوویەتیە کاری سەرەکی بۆ گەیشتنی ماناکان، تۆ چەندە کارت لەسەر پۆرترێت کردووە و چ واتایەکی گەیاندووە لەلای تۆ؟**

-هونەرمەندی شێوەکار بەگشتی پۆرترێتیان کردووە، پۆرترێتیش بەیەك لەو کارە هونەرییانە دەژمێررێت کە هونەرمەند پێی هەڵدەستێت، بەپۆرترێت زیاتر بۆ چوونی سایکۆلۆژی پێدەردەخات، لەوانە پۆرترێتە کانی (ڤان کوخ، گۆگان، جاك کلۆز، بیکۆن، ... هتد) هونەرمەندانی کوردیش بەهەمان شێوە پۆرترێتیان کردووە، پسپۆڕی لەپۆرترێتا کارێکی ئەوەندە هونەری نییە تاکو سەرقاڵی بم، کاتی خۆی کە سەرقاڵی بووم پۆرترێتم بۆ شاعیرە کوردە کلاسیکیەکان کردووە، و پاشان لە ئەوروپا بۆ مەسەلەی گوزەرانی تەواونییە؟

*** لەساڵانی ڕابردوودا باس لەوە دەکرا کە ئێمە پێویستمان بە ستایڵێکی تایبەت بە کورد هەیە، بەڵام ئێستا ئەو بیرۆکەیە کەمتر باس دەکرێت و لە بەرامبەریدا باس لە هونەرێک دەکرێت کە بۆ ئینسانە نەک تایبەتمەندێتی تۆ دەڵێی چی؟**

- پێشەکی هونەر کارێکی ئینسانی گشتییە، مرۆڤیش مرۆڤێکی کۆسمە پۆرتییە لەهەموو شوێنێك هەر هونەرمەندە، بەڵام بەڕای من کۆمەڵگەکان مۆرکێکی تایبەتی خۆیانیان هەبووە، میللەتی چین یان ژاپۆن و هندو فارس، هونەرمەندەکانیان تەنانەت هونەرمەندە نوێکانیان نوێخوازو مۆدێرنن، مۆرکی میللەتەکەی خۆی بەمانای مێژوویی، بۆنمونە هەندێ شت هەیە رابردووە، ئێمە گەر باس لەو هونەرە گشتییە بکەین ئیمڕۆ هونەری گشتی ئەوەیە کە سەردەمی ڕێنیسانس لەسەری دەڕۆیشت ئێمە ڕێنیسانس مۆدێلە، ئینسانە، بەپێچەوانەوی بیری ئایینی و دەسەڵاتداریێتی دەکردەوە، ئەوە بەو شێوەیە بڕوات هەموو هونەرێك وەکو یەکە، بەڵام گەر بێت و هونەر لەوسەردەمە نوێیانەدا

هونەر پێشکەوت و کەوتە ناو کەرەستەی مێژوویی، هونەر ئیلهامی لەفۆڕمی مێژوویی وەرگرت یاخود لەو فۆڕمانەی کە میللەتان هەیانە، هەر میللەتە و فۆڕمێکی تایبەتی هەیە، بۆچوونی تایبەتی هەیە بۆ ژیان هەموو ئەوانە دەبنە بنەمایەك تاکو مۆرکێکی خۆی وەربگرێت بۆ ئەو هونەرە ئینسانییە گشتگیرە.

***چ ئیحساسێک لەلای قەرەنی جەمیل دروست دەبێت کاتێک ئاستەکانی هونەری شێوەکاری جیانەکراونەتەوە و هونەرمەندیکی خاوەن ئەزموون و خوێندکارێکی پەیمانگە ولەهەمان هۆڵدا نمایشدەکەن؟**

-لەوڵاتی ئێمە تاکو ئێستا دەستمان بەهونەر نەکردووە، واتا ئێمە هونەرمەندین دەستمان پێکردووە، وەکو کۆمەڵگە و دەزگای حکومی و ڕۆشنبیری تاکو ئەمڕۆ نەشارەزان لەبواری هونەر و نمایشکردنی هونەرمەندان، ئێمە لەشاری هەولێر یەك هۆڵمان هەیە، ئەو هۆڵەش حەتمەن دەبێت هەموو هونەرمەندان لەوێدا پێشانگە بکەنەوە، ئەوە ئیحساسێکی ڕەخنەگرانەم لەلا دروست دەکات کە بە بەرپرسیاران، دەڵێم باشە هەولێر پایتەختێکی گەورەیە، شارێکی مێژوویی کۆنە، کۆمەڵێك هونەرمەندی زۆر زۆر باشی هەیە، بەڵام تا ئەمڕۆ هۆڵێکی نمایش نییە، ئەو هۆڵەیە کە هۆڵی پێشانگە نییە، بەڵام کراوە بەوە، سەرەتا ئێمە پێشانگەمان لە هۆڵی خوێندنگە سەرەتاییەکان دەکردەوە ، ئەمڕۆ ئەوانەش نەماوە، هەولێر بەلای کەمەوە پێویستی بەچوار هۆڵی گەورە هەیە، هەروەها شارۆچکەکانی دەوروبەر هەریەکەی دەبێت دووگەلەری هەبێت، گەر جیانەکرابێتەوە هونەرمەندێکی لاو ئاستێکی هەیە لە هۆڵێك پێشانگەیەك دەکاتەوە، بەڵام پەیمانگەی

هونەرەجوانەکان و ئاکادیمیای هونەرە جوانەکان، ئەوانەش هۆڵیان نییە، ئەمڕۆ تێکەڵاوییەکی ئەناریتچی دروست بووە لە کوردستاندا، تەنانەت لە ئاستی ڕۆشنبیری و ئەدەبیش تێکەڵاو بووە، دەزگاکانی حکومەت و وەزارەتی ڕۆشنبیری دەبێت پێشەکی بیرلەوە بکاتەوە کە لەگەڕەکەکاندا چەند سەنتەرێکی لاوان بکرێتەوە کە هەموو شتێك لە خۆبگرێت نەك بەتەنها هۆڵی پێشانگە، بەڵکو کتێبخانە و هۆڵی کۆمپیوتەر و مەلەوانگە، لەو حاڵەتەدا خزمەتیکی زۆری لاوەکان دەکرێت، هەروەها چەند گەلەرییەکی تایبەت هەبێت تاکو هونەرمەندانی خاوەن ئەزموون بەدیاری خۆیان نمایش بکەن، لەو حاڵەتەدا بابەتەکە جیا دەبێتەوە.

***بەم تێڕوانینەتەوە وەک هونەرمەندێک پێناسەت بۆ هونەر چییە؟**

-هونەری مۆدێرن لە کۆمەڵگەیەکی مۆدێرنەوە دروست دەبێت، باوەڕناکەم لەکۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەی ئێمەدا کەباس لەکەم و کووڕییەکانی هونەر دەکەین، کەباس لەوە دەکەین کە ئێمە مێژووی هونەرمان نییە، باوەڕ ناکەم هونەری مۆدێرن لە وڵاتێکی وەکو ئێمەدا هەبێت، هونەری مۆدێرن لەو وڵاتە دەبێت کە قۆناغی ئاسنین و بەردین، قۆناغی پیشەسازی و میترۆ و فڕۆکە و کۆمپیوتەر و عەولەمەو تەکنەلۆژیاو فەلسەفە و هەموو ئەوانەی کردۆتە بنچینەیەك بۆ ئەو ئەزموونە گەورەیەی کە هەیەتی، لەو حاڵەتە هونەری مۆدێرن دروست دەبێت، مەرجیش نییە ئەو کەسە خۆشی مۆدێرن بێت، بەڵام واقیعەکەی مۆدێرنە، بەڵام ئێمە گەر ئەمڕۆ خۆمان بەهونەرمەندی مۆدێرن بزانین، دەبێت ئەو کارە بکەین کە لەگەڵ واقیعی ئێمەدا دەڕوات، ئەگەر کردیشمان باشترە لەسەر بنەما خۆرهەڵاتییەکە و لەسەر بنەمای وڵاتی خۆمان، ڕاستە فیکر پێشکەوتووە، فیکری ئێمە دەڕوات بۆ دوور، سنوورەکان دەبڕێت، بەڵام کە دەگەڕێینەوە لەشەقامێکدا، لەکۆمەڵگەیەکدا، لەچایخانەیەکدا، لەبازاڕێکدا بێین لەکۆمەڵگەیەکی دڕو پیاوگەری و یەك ڕەگەز لەوڵات جوڵە دەکەن، هەمووی یەك مەجازە تارادەیەکیش ڕێز و شەرم و ئەوانەش جێگەی خۆی ناگرێتەوە چونکە ئەوانە هەمووی پەیوەندی بەلیاقەی کەسێتییەوەیە، مۆدێرنیزم ئەمڕۆ بەتەنها ئەوە نییە من لەبەر ئەوەی پێم نەڵێن دواکەوتووە، یاخود عەشایرییە، بڵێم من مۆدێرنم، بەڵام مۆدیرنی دەبێت بەدەست بگیررێت، وەکو واقیعێکە و دەبێت هەستی پێ بکەین، نەك بەتەنها لەکارەکتەر و کەسێتی هونەرمەند و مرۆڤەوە، بەڵکو لە واقیعی خۆشمانەوە، پاشان مۆدێرنیزم هەمووی پێکەوە دەست پێدەکرێت هەر لەفیکری حکومەتەوە بگرە وەك فیکر چۆن کۆمەڵگە پەروەردە دەکات لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن وەربگرە کە چۆن پڕۆگرام و کارەکانیان نمایش دەکەن، لەپارێزگا و شارەوانییەکانەوە دەبێت حسابیان بۆ بکەین کە چۆن خزمەت بەخەڵکی دەگەیەنن، واتا پێکەوە دێت، جیاوازی هونەرمەندی مۆدێرن یەکێك بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ.

***چوونە دەرەوەت چەندە دنیای کاری هونەریی گۆڕیت، لەهەمان کاتدا گەڕانەوەت بۆ کوردستان هیچ گۆڕانکارییەکی تری لەشێوازی کارکردنتا دروست کرد؟**

-ئەو کاتەی لە کوردستان بووم بە شێوازێکی تەعبیری نیمچە شەعبی کارم دەکرد، بۆچوونەکانم زیاتر شەعبی بوون، زیاتر ڕۆحێکی چینی چەوساوە و هەژاران بابەتی زیاتر بۆ بابەتە ڕۆمانسییەکان دەڕۆیشتم ڕەنگی شین و مۆر و زەردو پرتەقاڵی، ئەو ڕەنگانەی کە زیاتر ڕۆمانسیەت دەداتە کاری تەعبیری بەوانە کارم دەکرد، بەڵام کە چوومە دەرەوە سەرقاڵی ئەو هونەرە بووم کە لە ئەوروپادا بووە کاری تەجریدی و مەفهومی و کاری فیگەرم بەتەواوی بەجێ هێشت، تاکو قۆناغی هەشت ساڵ، پاشان بەتێکەڵاوییەکی خۆم هەوڵم داوە سوود وەرگرم، ئێستاش کە گەڕاومەتەوە زیاتر وەکو ئسلوبێکی کرستووم ماتڕیالی هەمە جۆر بەکاردەهێنم، لەناو کەسێکی تەجریدییەکی تەعبیریدا کاردەکەم و بابەتەکان زیاتر بابەتی تەجریدی و دراماتیکین و ڕەنگ کەمتر بەکاردەهێنم وەکو بڵێی ڕەنگ مردووە.

*دەتوانین دوایەمین ستایلی (قەرەنی جەمیل)بناسین؟
-مەرج نییە هونەرمەندەکە خۆی ستایلە، گەر ڕاستیت بوێت زۆر هونەرمەند هەیە دەڵێن ستایلی هەیە، ئاخر ستایل وەکو بیکاسۆ کە بابەتی خۆی دەکرد و قۆناغ بە قۆناغ خۆی دەگۆڕێ و دەگۆڕێ و لەسەر یەك ستایل نەبوو، بەڵام گەر ئێمە ستایل بەوە تێبگەین یەك جۆرە شێواز ئیشبکەین، باوەڕ ناکەم سەرکەوتوو بین، هەر بۆیە دەبێت بەدەوام بگۆڕرێین، ئەوە نەماوە هونەرمەند خاوەنی ستایلێکە بەری نادات نەکو ڕۆژێك لەڕۆژان نەیناسنەوە، بەڵکو هونەرمەندەکە بەو قۆناغی خۆی دەگۆڕێت، هەربۆیە زۆر هونەرمەند بەردەوام لەگۆڕاندایە.

***ڕاگەیاندنی کوردی بایی چەند توانیویەتی هونەری شێوەکاری کوردی بناسێنێ و چ ڕۆڵێکی گێڕاوە لەو نێوەندەدا؟**

-دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی بەپێچەوانەوە هۆکارێك بووە کە هونەر بخنکێنێت، هونەرمەندان لەبیربکرێن، چونکە ئێمە دەزگای ڕاگەیاندنمان زۆرە لە کوردستان، بەڵام کە ڕاگەیاندن شێوازێکی سیاسی دۆگمای وەرگرت هونەر دووردەکەویتەوە، چونکە هونەر لەو ڕاگەیاندنە دۆگمایە زۆر دوورە، قۆناغەکەشمان قۆناغێکی زۆر ناسکە، ئەو شتانەی کە تا ئەمڕۆ نمایشکراوە بۆ هونەر و هونەرمەندان بەڕێگەی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان زۆر سادەو ساکارن، لاواز و شەعبیانە باس لە هونەر و هونەرمەند کراوە، ئەمەش لەو بڕوایەدام هۆکارێکی سلبییە، لەناو ڕاگەیاندن پێویستە لایەنێکی تایبەتمەند هەبێت گرنگی بە هونەر و هونەرمەندان بدات، بەڕۆشنبیری بدات، وەکو لایەنێکی پەروەردەکاری کە دەبێت هەوڵی بۆ بدەن.

***دوایەمین پڕۆژە کە لەشاری هەولێر سەرقاڵن دروستکردنی مۆزەخانەیەکە دەکرێت ئاستەکانی پێگەیشتنی ئەو پڕۆژەیەمان بۆ ڕوون بکەیتەوە؟**

-مۆزەخانەی نیشتمانی هاوچەرخ تایبەتە بە هونەری شێوکاری (پەیکەر، تابلۆ، سیرامیك، گرافیك، فۆتۆگراف)، ئەو نوخبە باشەی هونەر و هونەرمەندانی ئەورووپیش بەشداری دەکەن، ئەم مۆزەخانەیە دیزاینی سەرەتایی تەواو بووە، ئێستا دەستکراوە بە قۆناغی دووەم کە لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەڵمانییەوە کاری تێدا دەکرێت، ئەندازیارە سەرەکییەکە ئیتاڵییە ناوی (مەویسۆر)ە، ئەندازیارێکی ناوداری ئیتاڵییە کە ئەم دیزاینەی دارشتووە، قۆناغی دووەمیش مانگی شەش تەواو دەبێت بەردی بناغەی دادەنێین و هەمووشتێك ئامادەیە، مۆزەخانەکە لەدوو نهۆمی گەورە پێك هاتووە لەسەر پارچە زەوییەکی (٥) هەزار مەتری دروست دەکرێت، شێوازێکی نوێی هەیە بە واقیعی کوردستان، هەروەها هۆڵەکانیشی زۆر گەورەن، ژێر زەمینێکی زۆر گەورەی هەیە، هۆڵی کۆڕ و سیمینار، کتێبخانە و شوێنی کتێب و کارت و پۆستەر چاپکراو بۆ فرۆشتن، هەروەها کافیتریا و حەوت هۆڵی گەورەی تێدایە، هەریەك لەو هۆڵانە (٣٠م×٢١م) دەبێت، هەروەها باخچەیەکی گەورەی هەیە.
ئێمە لەبەرنامەماندایە پەیوەندی لەگەڵ مۆزەخانە جیهانییەکان پەیدا بکەین، ئاڵوگۆڕی جیهانیی، هۆڵێکی تایبەت بۆ ئەو نمایشە جیهانییانە تەرخان کراوە، هەروەها بە بەردەوامی کاری دروستکردنی دەلیل بۆ هونەرمەندان، یان کتێب چاپکردن و پۆستەر، ئەو کارانەی کە پەیوەندی بە هونەری شێوەکارییەوە هەیە ئەو مۆزەخانەیە پێی هەڵدەستێت.

کارێکی پۆرترێتی هێڵکاری قەرەنی جەمیل کە ساڵی ١٩٧٠ کێشاویەتی

# لە بارەی ئەرکیۆلۆژیای کات و شوێن
# لە دواهەمین پێشانگەی قەرەنی جەمیلدا

ئەم چاوپێکەوتنە کورتەی هونەرمەند قەرەنی جەمیل کە لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە، سەبارەت بە دواهەمین پێشانگەی هونەریی ئەو هونەرمەندەیە کە ماوەیەك لەمەوبەر لە شاری هەولێر کردییەوە، چاوپێکەوتنەکە کورتە و زانیارییەکان لەبارەی تابلۆ و کار و تەکنیکی هونەریی ئەو هونەرمەندەوە خێران، بەڵام زانیاری گرنگن و پێمان باش بوو لەم ژمارە تایبەتەی ڕۆڤاردا وەك خۆی بڵاوی بکەینەوە.

ڕۆڤار

*** ناونیشانی ئەم پێشانگەیەت (ئەرکیۆلۆژیای کات و شوێن)ە، ئایا لەم قۆناغەی ئەزموونی هونەریت، هەستت بە گرینگی لێکۆڵینەوە یان گەڕان بە دوای کات و شوێن کردووە؟**

- ئەم بابەتە بە مانا خەیاڵییە ئینسانییەکەی وەك تیۆریا ماوەیەکی زۆرە کاری لەسەر دەکەم و هەوڵی ئەوەشم داوە فۆرمی بۆ دابڕێژم و بیخەمە نێو ئەو پانتاییەی کە دەربڕینە لە حاڵەتە کاتییەکانی دەروونیی مرۆڤ لە شوێندا. لەو پێشانگایە کات و شوێنم بە چەمکە واقیعییەکەی وەرنەگرتووە، بەڵکو بە ڕەهەندی چوارەمەوە بۆی ڕۆیشتووم، یاخود ئەو ڕەهەندەی کە لە نێو ناخی مرۆڤدا هەیە وەك کۆمەڵێ ئاوات و ڕاز و نیازی ئەنجام نەدراو لە کات و شوێنی واقیعیدا، کە بۆتە کتلەی هەمەجۆری سەیر و خنکاو لە نێو دەروونێکی ناموراد و بێهودە. ئینسان تەکامولی نەکردووە، یاخود باشترە وەك نیچە دەڵێ "ئینسان وەسیلەیە بۆ گەیشتن بە ئەنجامی بە ئینسانبوون"، چونکو کۆمەڵێ ئاوات لە ناخیدا ئێکسپایەر بووە گەر بێت و ئەنجامیشی بدات ئەوا لە کۆمەڵێ زبڵی دەروونی زیاتر نابێت. من لێرە هەڵکۆڵینێك لەم بابەتە دەکەم وەك گەڕان بۆ دۆزینەوەی ئەو فۆرمە نائاشنایانەی کە بە گوێرەی هەر ئینسانێك جاران زۆر ئاشنای بووە، بەڵام بۆتە ئاسەوارێکی ونبوو.

*** ئایا دەربڕینی ئەو هەست و خەیاڵانەت تا چەند بایەخی بۆ کۆمەڵگەیەکی وەکو ئیمڕۆی کوردستانی بە تایبەتی و مرۆڤایەتیش بەگشتی هەیە؟**

- پێش هەموو شتێك بایەخی ئەم بابەتە، یا وەك تۆ دەڵێیت هەست و خەیاڵ لای منە و لەسەر پانتایی تابلۆ دایدەڕێژم، بایەخ و بەهای ئەو فیکرەیەش لە مێژووی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی ئیمڕۆی کوردستانیدا زۆر گرینگە، چونکە دارمانی واقیع و حەقیقەتی ئینسان لێرەوە دەستی پێکردووە، لێرە مرۆڤ هەمیشە لە کات و شوێنێکی خەیاڵیدا دەژیێ، ڕابردوو زنجیرەیەکی پچڕپچڕە، هەموو فۆرمەکانی شێواوە، ئێستای بێ سەر و شوێنە و زۆر بێهودەیە، داهاتووی ئاسۆیەکی لێڵە و هیچ شێوەیەك بەدی ناکات، بۆیە لێکۆڵینەوە و گەڕان

بەدووای چەمکە وونەکان پێویستە. لەلایەکی دی هونەرمەند وەك کائینێکی پڕ هەست و فیکری ئینسانی لە جیهانێکی پڕ ئاژاوە و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمە لە هەموو جیهان، دەبێتە پارسەنگی واقیعەکە، تا ڕادەیەکیش لە کۆی ململانێیەکان، دوور لە هەڵوێستە ڕەق و دژوارەکان بە هەڵسەنگاندنێکی ڕۆحی دەڕوانێتە ئەنجامەکان، ئەمەش ئێستراتیژیای فیکری هونەری منە.

*** لە نێو کارەکانی ئەم پێشانگەیەت و کارەکانی پێشانگەکانی دیکەت چ جیاوازییەك هەیە؟**

- یەکەم شت ئەم پێشانگەیەم ناونیشانێکی هەیە کە (ئارکیۆلۆژیای کات و شوێن)ە و کارم لەسەر فیکرەیەکی کۆنکرێت کردووە، دووهەم وەك زنجیرەیەکی یەکگرتوو شێوە و ستایلێك، تەنانەت قەبارە و ڕەنگیش بە یەکەوە تابلۆکان دەبەستێتەوە، هەموو تابلۆکان باس لە یەك بابەتی ناوەڕۆك دەکەن. هەروەها وەك تەکنیك و ئەو فۆرمانەی کە بەکارم هێناون جیاوازن لەگەڵ کارە کۆنەکانم، لێرە بارستاییەکانم کەم کردۆتەوە و ڕەنگیش زیاتر بەرەو خاك و خۆڵەمێشی دەچێت، لە هەمان کات گرینگیم بە تاریکی و ڕووناکی داوە کە فۆرمەکان بەرجەستە دەکات جگە لەوە ڕەهەندەکانی سێیەم لە تابلۆکاندا زیاتر ئاشکران تاکو ئەو ناوەڕۆکەی کە من مەبەستمە وەك ناونیشانەکە بهێنمە دی.

*** کارکردن لەنێو قوتابخانەیەکی هونەری لەم سەردەمە تا چەند باوی ماوە؟**

- ئیمڕۆ باس لە قوتابخانەی هونەری ناکرێت، بەڵکو هەر هونەرمەندێکی داهێنەر هەوڵی دارشتنی فیکرە دەدات ئینجا بە تابلۆ بێت یاخود بەکارێکی دی. بە شێوەیەکی تر، لە سەرەتا ناوەڕۆك فیکرەیەکی ئەبستراکتە لە خەیاڵی هونەرمەند، ئەو دێت فۆڕم و کەرەستەی پێویست بەکاردێنێت بۆ بەدیمەنکردنی ئەو ناوەڕۆکە، ئەمەش ئەو ئازادییە هونەرییە دەبەخشێت کە لە چوارچێوەی قوتابخانەکان دەربچێت. بەڵام یەکێك دێت پێت دەڵێ ئەبستراکتی تەعبیری یاخود واقیعی تەعبیری یا هەر شێوازێکی دیکەی هونەری، ئەمەش بۆی هەیە ڕاست بێت، بەڵام گەر هونەرمەندەکە ئەو بڕیارەی دابێت کە لەسەر ئەو ڕێبازە کار بکات.

# ئاو لەبن تاشە سەختەندازەکاندا

ئەوە بۆ چەندین ساڵ دەچێت، هونەرێك وەکو یادەوەرییەکی پڕ لە هەرا و زەنای منداڵی، لە تەکمەوەیە، هونەرێك وەك سێبەر لەگەڵما بەڕێوەیە، لەکوچەکاندا، لە سەرمێزی قوتابخانەکاندا، لەناو یاریگاکانی منداڵیدا، لە بازاڕەکاندا، لە پەنابەرد و شاخەکاندا، بانگم دەکات، بە ڕەنگە ئاوییەکانی دامدەپۆشێ و لە مانەوە لە ناو وەستان و سڕیدا دەمپارێزێ، هەمیشە لەگەڵمایە، دەنگی ئەو هونەرە لە قووڵاییەکانەوە دێت، وەك ئەوە وایە، کە لە ناو چاخە بەردینەکانەوە، بانگم بکاتە خەڵوەتێ، کە هەمووی ڕەنگ و فرشە و پۆرترێت و بابەتە، هەمووی سیحر و وەهم و حەقیقەتە، هەندێ جار وەك دەنگدانەوەی هاوارێکە، لە ئاوەکان هەڵبستێ، ئەو ئاوانەی سەردەمانێك لەبن هەمووو تاشە و کەڤرێکەوە هەڵدەقوڵان، بینای مرۆڤیان لە ڕەنگی ئاو و ساماڵ دەگرت، هەمیشە دەپرژێنە ناو تەواوی وردە دەمارەکانمەوە، هێندە ئاشنان، هەردەڵێی ڕۆحی خۆمن هەڵدەپژێنە ناو گیانمەوە و شەلاڵی ژیانم دەکەن، ئەو هونەرە هونەرێکی ڕاستەقینەیە، کە لەگەڵ پرۆسەی داهێناندا، شادەماری بزوتنەوەی ئێستێتیکن، هەر لەگەڵ دروستبوونی هونەرمەندەکەوە خەڵق بووە، سەرەتا لە کوچە و کۆڵانەکانی تەیراوەدا، بە تەنکە شەرمێکی هەرزەکارییەوە، ڕاوی ئاسکەکانی جوانی دەکرد، بناغەی تەلارێکی ئێستێتیکی دادەڕشت، لەگەڵ کتێبەکاندا، سۆراغی جیهانبینی دەکرد، هەمیشە هاودەمی گۆماوەکان بوو، ئەو گۆماوانەی بۆ ئەو ئاسۆیەك بوو، ڕەهایی تیادا دەدۆزییەوە، ئەو گۆماوانەی کە باران خەڵقی دەکردن، ئاو و گیا بووبوو بە خولیایەکی هێجگار دەگمەنی ئەو هونەرمەندە، پاشان هەمان ئەو خولیایە گەورە بوو، بەرەو شارە گەورەکان چوو، تێکەڵ بە ئایدیالوژیا و کێشەکان بوو، تێکەڵ بە تەم و هەور و تاشە بەردەکان بوو، تا تێکەڵی دەریاکانی جیهان بوو، مەدای جیهانبینی و چەمکەکان، ئەو هونەرمەندەیان هاڕی، تا لە دواجاردا، لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بوو، بوو بە هونەرمەندێکی ئاویی، ئاو بە مانای حیکمەتەکان، بە مانا هونەرییە باڵاکان، لە ئاودا هەمووو ڕەنگەکانی دۆزییەوە، ئەو هونەرمەندە خاکییە قەرەنی جەمیلە، کە ئێستەیش وەك چۆن لە سەرەتاوە هونەرەکەی لەگەڵمایە، هەروا لەگەڵما ڕێدەکا.

لەم نووسینەمدا ڕامانکێشییەك، سەبارەت بە یەکێ لە تابلۆکانی دەکەم، ئەویش تابلۆی ئاوە لە شاخ شاخانێی دەگەڵ کەڵ دا.

هەمووو تابلۆیەکی شێوەکاری نا، بەڵکو هەمووو تابلۆیەکی هونەریی باڵا، کۆکراوەی خود و بوویەر و بابەت و مەعریفەی هونەرمەندە، بە مانایەکی دیکە، هونەرمەند بریتییە لە بوونی خوودی و لەدایك بووی واقیعی خۆی و لە بابەتی هەڵبژێرراوی خۆی و لە و مەعریفەیەی، کە ئەزموونی خۆی پێی دەبەخشێ، کە ئەمانە بەرهەم هێنەری پارادۆکسین لە هونەردا، واتە شتێك بەرهەم ناهێنن، مەئلوف بێت یا بچێتە ناو تەمی کارە باوەکان، یا لە ناو ڕاڕەوی سەلەفییەت کار بکات، بەڵکو ئاسۆی بوونەوە ڕەچاو دەکەن، بۆیە لە بەرامبەر ئەو جۆرە تابلۆ یا کەڤالانە، پێویستیمان بە بینینێ هەیە، کە پارسەنگی بابەتی لەگەڵ هەمان ئەو خود و بوویەر و بابەت و مەعریفەیە دروست بکات، پێویستیمان لە خودی هونەرمەند بە بینینی قووڵ و ئاگری ڕەنگەکان هەیە، لە بوویەری هونەرمەندا پێویستیمان بە لێکدانەوە و ڕامان هەیە، لە بابەتەکەشیدا پێویستیمان بەو چەمکانە هەیە کە پرسیار خەڵق بکەن، بەڵام لە مەعریفەکەیدا پێویستیمان بە دایەلۆگ هەیە، واتە خودی هونەرمەند پێویستی بە بینینی قووڵی بینەر هەیە، تا ئاسۆ بیرو کاری هونەرمەند بخوێنێتەوە، پێویستی بە ڕامانی بینەر هەیە تا ئەندێشەی کارە هونەرییەکەی ئاشکرا بکات، پێویستی بە پرسیاری بینەر هەیە، دواجار پێویستی بە دایەلۆگی بینەر هەیە، تا لە تولانەوەکانی بگەن، هەرکاتێکیش ئەو بەرامبەر بوونە، قیت کرانە سەریەکەوە، ئەوا پەیوەندییەکی قووڵی تێگەیشتن لە ماهیەتی یەکتری دێتە کایەوە، واتە ماهییەتی هونەری هونەرمەند و ماهیەتی بینینی بینەر، کە ئەمە زۆر پێویستە، تا بتوانین لە بەرامبەر تابلۆی هونەرمەندێکدا بوەستین و قسە بکەین.

ئەگەر تابلۆ لە ئەدەبی کرستیانیدا، بریتی بێ لە تابلۆی کەون و هەبوون، کە لە پەسلانەوە سەرچاوە دەگرێ و باس لە ڕۆژی لێپرسینەوە دەکات، پاشان باس لە مێژووی تراژیدی مەسیح و شەوق و مردنی بکات، کە هەمووی لە ئەنجامی بە یەکاچوونی فۆلکلۆر و فەلسەفەی کۆنەوە بوو، ئەوە لە ئەدەب و هونەری سەدەی ناوەڕاستدا، تێکەڵاوبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی، ژیانی ڕۆژانە بوو، بەڵام لە ئەدەبی ئەورووپیدا، بریتی بووە لە لەبەریەکترازان و گونجان، بە مانایەکی دیکە (تراژیدیا و کۆمیدیا) بەڵام لە سەردەمی ڕێنیسانسدا، تابلۆ لە تاك کورتکرایەوە، بەو پێیەی تاك نەیاری کۆمەڵ نییە، بەڵکو کورتەی پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکانە، بەم جۆرە تابلۆ بوو بە بەرهەمی کێشەی مرۆڤ، لەگەڵ ڕۆژانی پەسلان و ڕەوتی ژیانی ڕۆژانە و ترازان و گونجان و کێشەکانی تاك .

هەموو ئەوانەی گووتم بۆ ئەوەبوو، بچمە سەرباسی ئەو تابلۆیەی هونەرمەند قەرەنی جەمیل (کەڵ و ئاو) کە ڕووبەرێکی لە ڕەنگ داگیرکردووە، بەڵام ڕووبەرێك کە هەمووی جووڵە و بزاڤ و سەرسامییە، چەندین هاندەری هونەری تێدایە، کە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمەکانی ڕابردوو، ئەو سەردەمانەی کە ئاو سەر زەوی داگیرکردبوو، لە هەموو لایەکدا ڕۆحی ئاو زاڵی سەر زەوی بووبوو، گەورەترین جەنگی نێوان سروشتی ئاو و سروشتی بوونەوەر و هەندێ لە شەڕە شاخی کەڵەکان، لەگەڵ شەپۆلی ئاودا، بەرجەستە دەبوو، لە هەمان کاتدا ئەو تابلۆیە، دەمانهێنێتەوە سەر ئێستای ڕۆحە ونبووەکانی ئاو، جۆرێك نۆستالژیامان بۆ خودی ڕۆحی ئاو، بۆ دروست دەکات، بەو پێیەی کە وێنە ئەمانەتی هونەرە لای هونەرمەند، بۆیە دەبێت فرشەی هونەرمەند، فرشەیەکی پڕ لە ترس و حیکمەت بێت، لەکاتی وێنەکێشاندا، حیکمەتی قەرەنی جەمیل لەوەدایە، کە حیکمەتی ئاو زیندوو دەکاتەوە، لەکاتی کەمبوونەوە و کەمبوودی ئاودا، ناچارمان دەکات کە ئاو بکەین بە نموونەی باڵای ژیانمان، کاتێك مرۆڤ بەدیار ئەم تابلۆیەوە دەوەستێت، سەیری شاخی کەڵ و شەپۆلی ئاو دەکات، لەکاتی بەیەکاچوونیاندا، ڕاستەخۆ ئەو پرسیارە لای بینەر دروست دەبێت، کە ئاخۆ دەروونی هونەرمەند چەند پڕ بووە لە مانا گەورەکانی ئاو، بۆ ئەوەی هەمان ئەو هەندە زۆرە لە بینینی قووڵ لای بینەر دروست بکات؟ لە هەمان کاتدا بە سەیرکردنی ئەم تابلۆیە، چەند دەچینەوە ناو بوویەری هونەرمەند، تا تێبگەین کە ئەو، چەندی پرسیار کردووە، تا لەم بوویەرە بگات؟

بۆ ئەوەی ئەم هەمموو ڕامانە لای بینەر بێتە کایەوە، لە بابەتەکەشیدا ئەو هەمموو پرسیارە بۆ بینەر دروست بکات، ئاوێك کە سپی بچێتەوە لەناو شەپۆلدا، چاوچاوێنێ بکات لە بەرامبەر شاخی کەڵێکدا، ئەوسا ورد و خاش بێت، دەبێت چ دیمەنێك هەڵڕژێنێتە سەر ڕۆحی بینەرەوە، ئاو لای هونەرمەند ڕەنگە، ڕۆحە، بزاوتێکی ئەبەدییە، ترسە، هەڵگری هەزاران بیرۆکەی هونەرییە، کاتێکیش کە من لە بەرامبەریا دەوەستم، ڕەنگەکان دەبن بەهێشووی پرسیار، ڕۆحی ئاوەکان دەبن بە چەپکێ لە ترسی با، بزاوتی ئەبەدی هەمان ئەو ئاوەش، دەبێتە هەڵگری من و بە دونیادا دەمسوڕێنێ، سەیرکە ئاو لەژێر شاخی کەڵدا، لە جەنگێکی پڕ لە خۆشەویستیدا، بینەر بۆ کام دەرەتان دەباتەوە و چی بۆ دروست دەکات.

شاخی کەڵ، سیمبولی هێزە، بەڵام هێزی شەرانگێزی و کوشتن نا، بەڵکو هێزی جوانی، هێزی ئێستێتیکا، هێزی جەوهەر، هێزی ڕۆحێکی کوژران بە جوانی ئاو و لە ناوچوونی نا، هێزێکی پرۆمیتۆسی لە دزینی ئاگری خوداوەندەکاندا، هێزی شاخی کەڵێ لە گەڕان بە دوای دزینی ئاودا، کەواتە هونەرمەند لە شاخی کەڵدا، بەرهەمهێنەری جوانی هێزە لای بینەر و بوویەری هونەرمەند لە شەپۆلی ئاوی سپی دا دروست کەری ڕامانە لای بینەر و بابەتی هونەرمەند لە بەیەکاچوونی کەڵ و شەپۆلدا جێی دایەلۆگی بینەرە.

بەمجۆرە لە تابلۆی کەڵ و شەپۆلی قەرەنی جەمیلدا، بینەر و هونەرمەند دەبن بە یەك قەبارەی شێلگیر و جۆرێك لە دۆناودۆنی سۆفیگەرێتی دەخولقێ و بینەر دەچێتەوە سەر هەزاران بیرۆکەی ڕابردوو، بە دەیان بیرۆکەی ئێستا بونیاد دەنێت، باشە تۆزێ لە تابلۆکە ورد بەرەوە، ئەوە جگە لە ئاو هیچ شتێکی دیکە چەمکی نامینێ چونکە (تەنها ئاو وەك ئاو وایە).

ئەو مەنتیقە لەو تابلۆو کەڤالانە تێگەیشتم کە قەرەنی ناوی نابوون ( ئارکیۆلۆجیای کات و شوێن).
هەروەها لەوەش گەیشتم کە ڕەنگ: فیزار و هاواریشە، تەنیایی و نادیاریشە. تەلسکۆبە بۆ دیتنی دوورایی ناخ ، میکرۆسکۆبە بۆ نیشاندانی ناخی ئاخ! ناخی ئاخ کوێیە؟ دۆزەخە یان بەهەشت؟ قەرەنی بە ئاماژە ڕەنگی ناردووە بۆدۆزینەوەی کە هاتۆتەوە پەنجەی خۆی گەستووە لەحەژمەت ئەوەی دیویەتی، چی دیوە؟
دۆزەخ هێندە دوور نییە، ئەوەتا بە تەنیشتمانەوەیە و لە پێشمانەوەیە و لە ناشوێندایە. دۆزەخ هەر تەنیا ئاگر و لافاو نییە و هەر تەنیا مەنجەنیق و ئازار نییە، وێرانیی دۆزەخە و تەنیایی دۆزەخە و گەورەترین دۆزەخیش وا لەناخدایە!
ئەوجا ئەو هاتووە و ناخی هەڵگێڕاوەتەوە و جارێکی تر ڕووبەڕوو شوێنەواری ئەو دۆزەخەی ناخی پشکنیوە و تراژیدیایەکی تازەی لێ دۆزیوەتەوە و لە کۆنەوە بەو جۆرە دۆزینەوەیە دەوترێ هونەری کاکڵە. ئەو جۆرە هونەرە لای کەم هونەرمەندیش هەیە. ئەوەی یارمەتی قەرەنی داوە بۆ ئەو دۆزینەوەیە دوو شتە ، یەکیان وەستایی و کارامەیی بە تەعبیری (ئیلیۆت) بۆ هونەری (ئیزرا پاوند) و ئەوی تریشیان جورئەتی یاریی و سەما لەگەڵ ڕەنگ، پێم وایە قەرەنی لەو تابلۆیانەیدا گەیاندوویەتییە ئەوپەڕی، دەڵێی کۆتایی دنیایە.
ئەو جۆرە مەترسییەی نیشانی داوە ناخ هەژێنە و هەر بە تەعبیری ئیلیۆت داهێنان دەبێ بمانتۆقێنێ بە پێچەوانەی ئەوەی ئەرستۆ وتوویەتی دەبێ ترس بڕەوێنێتەوە. نایشارمەوە کە ئەو تابلۆیانەی قەرەنی کە وەکو سەمفۆنیا بوو، سەمفۆنیای پێنجەمی بتهۆفن و هاملێتی شەکسپیریان هێنامەوە یاد. لە یەکەم سەرنجەوە بۆنی مەترسی هات و گومان سەریکرد، ڕەنگی قاوەیی بە هەموو شوێنێکدا پەرت ببوو، ڕەنگی ڕەش و خۆڵەمێشی و تۆنەکانیان و تۆنی تۆنەکانیان. بە ئەندازەیەك وێرانی بڵاوببووەوە مەترسی گەیشتبووە بزنە کێوییەکانیش ئەوانیش چووبوونە سەربەرزاییەکان و لە وێرانی ڕامابوون، ئەمما چ ڕامانێك؟!

*دەمەوێ بچمە ناو ئەو دنیایەی قەرەنییەوە: ئەو هەموو وێرانییە چییە و ئەو هەموو ترسە لە کوێ هات؟
خاك جێی دەرزییەکی تێدا نەماوە ژیان پێیدا بڕوات، دەبێ دووباڵی لێ بڕوێ. ئەو هەموو قاوەییە تۆخە شتێك بوو پێیان دەوت زەوی، و ئەو شلەیە مەیلەوسپییەش کە ڕەنگی گۆڕاوە و دەڵێی ژەهرە ڕژاوە پێیان دەوت ئاو. ئەدی مرۆ؟!
ئەوەی دەیبینی هەمووی دۆزەخی ئەوە کشاوە!
لەو جیهانە سەراسیمە و لینجەدا ڕۆیشتن حەرامە چ جای پیاسە، هەناسە حەرامە چ جای گۆرانی، ئاسمانیش چەند پارچەیەك شینی جێماوە لەناو بۆشایی و ئەو پەڕی غەریبیدا.
حەسوودییم بەو بزنەکێویانە هات کە گەیشتبوونە ترۆپکی وێرانیی، حەسوودیم بەو کانیلەیە هات کە لەو وێرانەیە جێمابوو، حەسوودییم بەو خەیاڵە وردەی قەرەنی هات: ئەو دوو ڕەمزەی چۆن هێنا و کردی بە شایەد؟
ئێمە لەناو جیهانێکدا دەژین کۆتایە کەچی وەکو ئەوەی نە بامان دیبێ و نەباران وایە، خودایە قەرەنی چۆن زاتیکرد موغامەرە بە بوونەوە بکا: لەکاتێکدا کە بیناو باڵەخانە و چی و چی دروست دەکرێ، لەو کاتەی گوایە وڵات سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە، ئەو هات و زەنگی وێرانی لێدا.
هونەرمەند زمانی ڕاستەقینەی سەردەمەکەیەتی ، بۆیە دەبێ بەوپەڕی جیدییەتەوە گوێ لەو زەنگە بگیرێ. قەرەنیش لەو ئاگادارکردنەوەیەدا سنووری ناوچەیەك و مەملەکەتێکی نەکێشاوە، بەڵکو گشتییە و خەمێکی سەرتاسەرییە و بەمەش لەتخوبی شوێن و کات چۆتە دەرەوە و هونەرەکەیشی هونەری ناکات و ناشوێنە.

*دنیای بێ ئەستێرە کوێیە؟
دنیای بێ خۆشەویستی کوا؟
کاری هونەر نیشاندانی ئەستێرە نییە، بەڵکو شاردنەوەیەتی، هەروەها خۆشەویستیش دەبێ شاراوە بێ، هەتا هونەر و ژیان لە یەکتری جودا بکرێنەوە. چونکە ژیان تامی لە خۆیدایە نەك لە کۆپیکردنیدا. قەرەنی وەستایانە وای کردووە و خۆشەویستییەکی بێسنووری شاردۆتەوە لە پشت ئەو هەموو وێرانەیەدا. ستایش و سوپاس بۆ ماندووبوونی.

"تیۆریای ماتریالیستی (ئایدیالی) کە گوایە مرۆڤ بەرهەمی دەوروبەر و پەروەردەیە... لە بیردەکات کە دەوروبەر ڕێك لە لایەن مرۆڤەوە دەگۆڕڕێت و خودی پەروەردەکاریش پێویستی بە پەروەردە هەیە.
(کارل مارکس ١)

لەو وڵاتانەی کە سیستەم و یاسا، حکومەت و پەرلەمان و فرە حیزبین، مونافەسە و جیاوازی بیروڕا و گفتوگۆکانیان لە پەرلەمان و نێوان حیزبەکان هەمووی لە پێناو بەرێوەبردن و باشترکردنی بارودۆخی خزمەتگوزاری میللەتەکەیانن، کە ئەویش پێکهاتووە لە هەموو چین و توێژ و ئایینەکان، کە حکومەت و پەرلەمان و حیزبەکانیش بەشێکن لەو میللەتە.
وڵاتێك یا نەتەوەیەك، کە چوارچێوەیەکی جوگرافیی دیاریکراوی بۆ دانرا، ئەگەر وەك سنوور بێ، یاخود شێوەیەکی سیاسی- مرۆڤایەتی، ئەوا لەو چوارچێوەدا هەموو کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات، کە پێکهاتووە لە پرۆژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی، پیشەسازی، کشتوکاڵ، پەروەردە، هونەر و ڕۆشنبیری، گەشەپێدانی شار و لادێکان و زۆر بواری دیکە... فرە حیزبی سیمایەکی دیمۆکراسییە و بوونی ئۆپۆزیسیۆنیش لە هەر وڵاتێك ئەوە دەگەیەنێ کە خەڵك بە سەربەستی خۆیەوە حکومەت لە یەکێ لە حیزبەکان هەڵدەبژێرێ و ئەوانی دیکە لە نێو ڕاو بۆچوونەکانی جیاواز دەمێننەوە، لە هەمان کاتیشدا هەموویان بەیەکەوە سیستەمێك پێك دێنن کە زۆر جیایە لە دیکتاتۆری و تاك ڕەهەندی سیاسی و فیکری. لە ئەنجام ڕووگەی هەمووی بۆ بەرەو پێشبردنی کۆمەڵگەیە و هەمووشیان بەرپرسیاری ڕاستەوخۆن بەرامبەر بە میللەت، بەرپرسیاری هەموو کووچە و کۆڵانەکانی سەرتاسەری وڵاتن، بەرپرسیاری دەرگا و پەنجەرەی هەموو ماڵەکانی وڵاتن، بەرپرسیاری هەر بستێك لە خاك، ئاو و ئاسمانی وڵاتن. بەڵام لێرەدا سیستەمی سیاسی و فرە حیزبی و پەرلەمان و دەزگاکانی حکومەت و یاساکانی، کە وەك کتلەیەکی سیاسی دیمۆکراسی بۆ بەرێوەبردنی کۆمەڵگە و ڕێکخستنەوەی و دابینکردنی خزمەتگوزاری و بەرگریکردن لێی، وەك شێوە ڕووخساری بە دیارکەوتن بەبێ بنەماکانی فیکری و هونەر و ڕۆشنبیری ناتەواو و نادروستە. چونکە هەر سیستەمێکی حکومڕانی بە هەموو بۆچوونەکانی فیکری و سیاسییەوە گەر بیەوێت حەقیقەتی بوونی خۆی بە شێوە بنوێنێ دەبێ لە نێوان هونەر و ڕۆشنبیریدا خۆی نمایش بکات، بە مەبەستی ئەوە کە دەبێ خاوەن ئەو بەهرەیە بێت کە بتوانێت پلە و پایەی هونەری و ڕۆشنبیری بۆ خۆی دابین بکات، تا ببێتە ڕووخسارێکی پیرۆزی میللەت و هەمیشە وەك شارستانیەتێکی پێشکەوتووی ڕۆحیی لە جیهانی ئێستێتیکی ببینرێ.
هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە لە چوارچێوەی سیستەمێکی دیاریکراو، بە پلان و پرۆژەی ستراتیژی درێژخایەن، بەیەکەوە گەشە دەکەن و پێش دەکەون. ئەوەش کاری سەرەکی حکومەتە کە دەبێ ئەو فیکر و عەقلە سیاسییەی کە هەیەتی بۆ ئەوە بەگڕی بێنێت و هەموو توانا تایبەتییەکانی نێو کۆمەڵگە بۆ ئەو مەبەستە بەکاربێنێت. ئاشکرایە، پاش ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری و هاتنی قۆناغێکی تر و دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتی، بارودۆخی وڵات بە تەواوی دەگۆڕێت. پێشەکی بۆشاییەکی گەورە دروست دەبێت کە دەبێ بە شێوازێکی نوێ و سەردەمیانە پڕ بکرێتەوە، ئەوا جگە لە داڕشتنی ژێرخانێکی کۆنکرێتی ئابووری و بەرێوەبردن، پێویستە سیستەم فیکری هەبێت بۆ نوێکردنەوەی هونەر و ڕۆشنبیری، هەروەها پێویستە حکومەت ڕۆشنبیر بێت تاکو جۆری ڕۆشنبیری بناسێت و لە هی ڕابردوو جیا بکاتەوە، واتە هەر سیستەمێکی نوێ بێتە ئاراوە، ئەوا بنەمایەکی ڕۆشنبیری خۆی هەیە، یاخود خاوەن تیۆریایەکی تازەیە بۆ بەگەڕخستنەوەی ڕۆشنبیری بە جۆرێکی هەماهەنگی- هاوچەرخیی بارودۆخی نوێی وڵات. لە هەمان کاتیشدا نوخبەی هونەری و ڕۆشنبیری کاریگەری خۆیان دەبێ بەسەر ئەو بارودۆخە نوێیە، بەسەر سیستەمی سیاسی و حکومی، ڕەنگە لە هەندێ قۆناغدا ئەو کاریگەرییە زۆر زیاتر بێ لەوەی بەرامبەرەکەی بەسەر خۆیدا. لێرەدا بە ڕۆشنبیریکردنی سیستەمێکی نوێی دیموکراسی، کە پێشتر لە نێو چوارچێوەی تاك ڕەهەندی و دیکتاتۆریدا، ڕۆشنبیری و هونەر چەقبەستوو و وشك، لە قەیرانێکی ساڵانێکی زۆردا خنکا بوو، کارێکی سەرەکی هەموو لایەنە حکومی و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی

سەردەمی وڵاتە. ئەم پرۆسێسە لەو وڵاتانە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەنجام دەدرێت کە لە بنەڕەتدا خاوەن پاشخانێکی مێژوویی قووڵی هونەر و ڕۆشنبیرین، ئینجا ئەو دیموکراسییەی کە بنیات دەنێن لەسەر بنەمای ئەو مێژووە دادەمەزرێنن، چونکە سیستەمی سیاسی تاك ڕەهەندیی دیکتاتۆری لەسەر بنەمای فیکرێکی سیاسی دیاریکراو بنیات دەنرێت نەك لەسەر بنەمای مێژوویی فیکری و هونەر و ڕۆشنبیری میللەت.

بۆنموونە، بارودۆخی هونەر و ڕۆشنبیری لە عێراق بە گشتی و لە کوردستان بە تایبەتی لەم قۆناغەدا (قۆناغی سەرەتای دیموکراسییەتێکی نەزۆك، پاش ڕوخانی ڕژێمی دیکتاتۆری)، بەرەو هەڵدێرێکی نادیار دەڕوات، ئەوەش بۆ قەیرانێکی قووڵی فیکری سیاسی و هەرەسهێنانی سیاسەتی بەڕێوەبردن و یەکنەگرتنەوەی زنجیرەی مرۆڤایەتی و تێنەگەیشتن دەگەڕێتەوە، هەروەها خۆپەرستی نەتەوەیی و تایەفەگەری وەك هۆکارێکی کۆنەپەرستی تاکڕەهەندی، هەموو بوارە ڕۆشنبیرییەکان وەلادەنێ و بە هیچ جۆرێك گرینگی پێنادرێت. ئەمانە هەمووی بەیەکەوە بۆتە ئاستەنگێکی گەورە لە ڕێگەی پەرەسەندن و گەشانەوەی ئەدەب و هونەر و ڕۆشنبیری. دەوڵەتی عێراق ئیمڕۆ بە ناو وڵاتێکی (فیدڕالی دیموکراسییە)، بەڵام سیستەمەکەی لە حکومەتێکی تەوافوقیی یەکیەتی نیشتیمانی پێکهاتووە کە هەموو لایەنەکانی نەتەوەیی و عەشایەری و تایەفە ئایینییەکان بەشداری دەکەن، هەر لایەنێکیش خاوەن وتاری نەتەوەیی خۆیەتی و دەیبەستێتەوە بە ئایینی ئیسلام، بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی خۆی تێدا گوم بکات و وتاری تایبەت بە خۆیان نەبێت. ئەم حاڵەتە تەوافوقییە ڕێگری هەرە گەورەی دیموکراسییە و میللەتیش لەو مەسەلەیە تێناگات. ئەوەتا دەبینین هەر لەساڵی ٢٠٠٣ تاکو ئیمڕۆ حکومەت وەك سیستەمێکی تازە، هیچ بنەمایەکی فیکریی سیاسی نییە بۆ بەرهەمهێنانی شێوازێکی نوێی ئەدەب و هونەر و ڕۆشنبیری، تەنانەت لە دەستووری عێراقیشدا لە هیچ خاڵێکدا بایەخ بەم لایەنە نەدراوە. سیاسەتمەدارانی عێراق بە هەموو لایەنەکانیانەوە سەرەڕای بێ بەهرەیی لە سیاسەت و یاسادا، دیماگۆگی لە وتاری حیزبایەتی و بێ پرۆژەیی و بێ بنەمای فیکری کۆمەڵایەتی و نیشتیمانی، دەستوورێکیان داڕشتووە، بەلای خۆیان وا دەزانن لە مێژووی هیچ میللەتێك وەك لە عێراق، خاوەن یاسا و دیموکراسی نین، وەك لە دیباجەکەیدا هاتووە: (ئێمە ڕۆڵەی میزۆپۆتامیاین، کە نشینگەی پێغەمبەران و ئارامگای پێشەوایانی پاکیزە و پێشڕەوانی شارستانیەت و داهێنەرانی نووسین و لانکەی ژمارە دانان بووە و، لەسەر خاکماندا مرۆڤ یەکەم یاسای داناوە و لە نیشتمانی ئێمەدا کۆنترین سەردەمی دادپەروەریی بۆ سیاسەتی وڵاتان تۆمار کراوە و یاوەران و ئەولیاکان لەسەر خاکەکەماندا نوێژیان دابەستووە و پێتۆل و زانایانیش تیۆریان داڕشتووە و ئەدیب و شاعیرانمان داهێنانیان کردووە.)٢، لێرەدا گەر دەستەی سیاسەتمەداران ئەوە تێڕوانینی سەدەی بیست و یەکەمیان بێت و وڵاتیش نغرۆی تەپ و تۆزی گەندەڵی بێ، چۆن دەتوانن بیر لە هونەر و ئەدەب و فەلسەفە و زانیاری بکەنەوە و پرۆژە بۆ پەرەسەندن و بوژانەوەی ئەم لایەنە بهێننەدی. لە دیدی من ئەوانە خاوەن تێڕوانینی دۆن کیشۆتین و حەقیقەتی بەرچاو نابینن. ئەوەتا دەبینین لە نێو ئەو ژینگە پیسە و ئەو بارودۆخە شێواوەدا، هونەر و ڕۆشنبیری، ئەدەب و فەلسەفە، هەڵسەنگاندن و ڕەخنە، بێ پشتگیری و پاڵپشتی حکومی و کۆمەڵگە، بە تەنیا خۆی بنیاد دەنێ، بەڵام ئەویش بە شێواوی کە تا ڕادەیەك بەرەو هەمان هەڵدێر دەڕوات و لە واقیعی کۆمەڵگە دووردەکەوێتەوە.

هونەرمەندان لەنێو ئەو واقیعەی ئێستای عێراقدا تەواو نامۆن و لە پەراوێزی هەموو ڕووداوە سیاسییەکاندان و هیچ کاریگەرییەکی وایان بەسەر ئەو بارودۆخەدا نییە، چونکە بە شێوەیەك پشت گوێ خراون کە خۆشیان نازانن چۆن بێنەوە ڕیزی پێشەوەی کۆمەڵگە و خۆیان پێ بناسنەوە. هونەر و ڕۆشنبیری لە سەرتاسەری عێراقدا لەنێو ئەو جیهانە هونەرییە پێشکەوتووە و ئەو هەموو تیۆریا و فەلسەفە نوێیەی دنیادا، بەهۆی ئەو واقیعە شێواو و نادروستەی سیاسی و تاکڕەهەندی بینین و بەرژەوەندیی خۆپەرستانەی سیاسەتمەداران و حکومەت و تەشەنەکردنی دیاردەی گەندەڵی تا سەر ئێسقانیان، بابەتێکی هاوچەرخانەی هونەری نابینن کە شێوە و شێوازێکی هونەری پێ بێتەدی، واتە شێوازێك لە هونەر و ئەدەب دروست نابێت کە ڕەنگدانەوەی قۆناغێك بێت پێی بگوترێت قۆناغی

پاش دیکتاتۆری یا سەردەمی دیموکراتی لە عێراق، بۆیە هونەر و ئەدەب و هەموو جۆرە تیۆریاکان، لە بازنەیەکی مێژوویی سنووردار دەسوورێنەوە، جارێك وەك دیباجەکەی دەستوور بۆ شارستانییەتی بابلی و ئاشووری دەگەڕێنەوە، یاخود بۆ پانتایی مونەمنەماتی ئیسلامی ڕۆمانتیکی، یا بۆ کەلەپوور و فۆلکلۆری نەتەوەیی، جارێکیش بۆ لاساییکردنەوەی شێوازەکانی ڕۆژئاوایی و ونبوون لەنێو پێناسەکانی دیکە دەگەڕێنەوە، کە هەمووی بە گشتی بێ ئومێدی و بێ هوودەیی دەگەیەنێت، دەرچوونیش لەم بارودۆخە شێواو و تۆزاوییە لە توانای هونەر و ڕۆشنبیریدا نییە، بەڵکو دەبێ گۆڕانکارییەکی قووڵ لە سیاسەتی حیزبەکان و فیکری سیاسی حکومەتدا دروست ببێت و بنەمایەکی ڕاست و زانستیانەی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەقامگیر، بهێننەکایەوە.
کاندینسکی دەڵێت: "هەر کارێکی هونەری ڕۆڵەی زەمەنی خۆیەتی، زۆر جاریش دایکی هەستەکانمانە... هەوڵدان بۆ ژیانەوەی بنەماکانی هونەری ڕابردوو بە گشتی، بۆی هەیە کارێکی هونەری، وەك منداڵێکی مردوو پێش لە دایکبوون، بێنێتە ئەنجام".٣
ڕۆحی میللەت لە نێو هونەرەکاندایە، شێوەکاری، شیعر، ڕۆمان، مۆسیقا، شانۆ و سینەما... هەموویان بنەمای چێژی ڕۆحی و ئێستێتیکی بۆ مرۆڤ دروست دەکەن و بەهایەکی مێژوویی بۆ کۆمەڵگە بەرهەم دێنن کە نەمریی و پیرۆزیی خۆیان تێدا دەنوێنن. بوژانەوە و گەشەسەندنی هونەر و ڕۆشنبیری پەیوەستە بە پێشکەوتنی هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئابووری و زانستی، هەروەها بە هاتنە کایەی فیکر و دیاردە فەلسەفییەکان، کە دەتوانرێت وەك پشتبەستن پێیانەوە، زەمینەیەکی ئەموار بێتە ئاراوە بۆ ئەو گەشەسەندنەی هونەر و ڕۆشنبیری. بیرمەندی ئێرانی داریۆش شایغان دەڵێت: "ئایا دەتوانین لە بارەی هونەرەوە بڵێین دیاردەیەکی دابڕاوە و هیچ پەیوەندییەکی بە دیاردە فیکرییەکانی دیکەوە نییە؟ بێگومان نەخێر، چونکە وەختێ فیکر هەڵدەکا و چالاك دەبێت، ئەوا لە گشت بوارەکاندا دەجووڵێت. هیچ هونەرێکیش ناتوانێ سەرهەڵبدا بەبێ ئەوەی بە نەشونماکردنێکی لە شێوەی خۆی بە کایەکانی دیکەی فیکر پشتبەست کرابێت. ئەو گوتەیە بە پێویستی دانانێت کە هونەرمەند بەئاگا بێت لەو

کارانەی ئەنجامی دەدات، بەڵام مەرجی کرانەوەی دەوروبەر و بارودۆخی گونجاو بە پێویست دەزانێ تا گشت دەرکەوتە سوود بەخشەکانی فیکر لە پرۆسەی کرانەوەدا هاریکاری یەکتربن، ئینجا ئەو کاتە باس لە ڕۆحی سەردەم دەکەین، گرینگ نییە داخوا ئەو ڕۆحی سەردەمە (قەدەری بوون) بێت، یا مەرجە دیالێکتیکەکانی قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوو بێت. بەو جۆرە دەبینین هونەری ئەوروپایی دیاردەیەکی دابڕاو نییە لە کۆی ڕۆشنبیری هاوچەرخ لە ڕۆژئاوا، چونکو پەیوەندییەکی ئۆرگانیکی لە نێوان شۆڕشە جیاوازەکاندا هەیە کە لە هەموو مەیدانەکانی مەعریفە بەڕێوە دەچێت."٤

ئەوەی لەم چەند ساڵەی دوایی لە عێراق ڕوودەدات شیزۆفرێنیایەکی سیاسی- حیزبییە، کێشە و ڕکابەرییەکان لە لۆژیکی عەقڵ، یاخود لە پێشکەوتنی مێژووی فیکری سیاسییەوە ڕوونادەن، بەڵکو لەوەوە دێت کە گۆڕەپانی سیاسی عێراقی بەتاڵە لە بەهرەداری ڕاست و دڵسۆزی وڵات، ئەوەی هەیە هەست بە بەرپرسیاری میللەت ناکات، خاوەن کەسایەتی دووانەییە، هەمیشە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان کەسایەتی ڕاستی خۆیان و وتارە سیاسیەکەیاندا هەیە. ئەوانە دەزانن میللەت (کتلەیەکی قەدەرییە و هەردەم لەسەر هەقە)٥ بۆیە بەناوی میللەت دەدوێن، وتارە دۆگماییەکانیان بەسەردا دەفرۆشنەوە، حیزبەکان هەوڵی بە حیزبکردنی میللەت دەدەن، بە تایبەتی حیزبە گەورەکان (عەرەبی و کوردی)، ئەو خەسڵەتەش سیمایەکی دیکتاتۆریانەی هەیە و بە پێچەوانەی سیستەمی دیموکراسییە. کەسایەتی مرۆڤی عێراقی بە گشتی لاواز و خەمگینە، بێ پشتە، پاڵی بە هەوا داوە و بێ سەقامگیری دەروونییە، هەمیشە ترسێکی ئەبەدی هەڕەشە لە بوون و باری گوزەرانیی دەکات، وەك منداڵێکی بێ دایك و باوك بنەمای خێزانگەری و کۆمەڵایەتی لە دەست داوە، کەسێکی نییە بەرگری لێ بکات. مرۆڤی عێراقی لەهەر شوێنێك مافی پێشێل کرابێت، یاخود ئەزیەت درابێ، چ بە کوشتن بێت یا مردن، یا ونبوون، هیچ لایەنێکی حکومیی یا حیزبیی شك نابات بەرگری لێ بکات و لەسەری بێتە وەڵام و بپارێزێت، کەچی دەبینین کەسی وڵاتانی تر، بۆ نمونە ئەڵمانی یا ئەمریکی، هەر وڵاتێکی ئەوروپی... ئەگەر لە دەرەوەی وڵاتی خۆشیان ژیانیان لە ژێر مەترسی

و هەڕەشە دا بێت، یەك ڕۆژی پێ نابا لەسەری دێنە وەلام و پشتی دەگرن و لێیدەپێچنەوە، بەلام لە لای ئێمە بە پێچەوانەوەیە، بە سەدان مرۆڤی عێراقی بە کورد و عەرەب و نەتەوەکانی دی لەم قۆناغەدا لە دەرەوەی سنوور پەراگەندە و بێسەروشوێن ژیان لەدەست دەدەن، بێ ئەوەی حکومەت و حیزبەکان بایەخیان پێ بدەن.

لێرەدا مرۆڤی سەربەخۆ و بێ لایەن لە دەرەوەی حیزبەکان، بە تایبەتی هونەرمەندان و ڕۆشنبیران، ئەوانەن کەسی ڕاستگۆ و دڵسۆزی وڵات، هەمیشە ئەوە ڕەچاو دەکەن کە وڵات و میللەت لە نێوان کاری هونەری و ئەدەبیدا پیرۆز بکەن، ئەوانەن کە ناسنامەی ڕۆحی و ئێستێتیکی بۆ وڵات ئەنجام دەدەن و بنەمای مرۆڤایەتی و دیموکراسی بۆ وڵات دروست دەکەن، بەلام خۆی ئەوانەن کە لاچەپ و پەراوێزکراون، هیچ پشتگیرییەکی ڕۆحی و مادییان لە لایەن حکومەتەوە نییە، کە ئەمەش هۆکارێکی گەورەیە بۆ تێکشکانی پانتایی مرۆڤایەتی و شێواندنی سیستەمی دیموکراسی لە وڵات.

**"شۆڕشەکان هەمیشە لە چاکسازییەوە دێن، هەروەها بزاڤی پێشکەوتن هەمیشە لە حەزی گەڕانەوە بۆ دوواوە، هەڵدەقووڵێت."٦**

بارودۆخی هەرێمی کوردستان لە هەموو سەردەمێك جیاوازترە بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی دیکەی عێراق. ئەو گیروگرفتانەی لێرە ڕوویداوە و ڕوودەدەن بە پێی حەتمییەتی مێژوویی، ئەنجامێکی تایبەتی بۆ چارەنووسی میللەتی کورد پێکهێناوە و وتارێکی سیاسی جیاوازی لە نێو حیزبە کوردییەکان دروست کردووە، بەلام جیاوازییەك تەنها لە زمان و شێواز نەك لە ناوەڕۆك، واتە عەقڵی سیاسی کورد لە نێو وتارێکی سیاسیی دۆگمائامێزدا چەقی بەستووە و ئەنجامێکی دروست و پشتبەست بە بڕوای جەماوەریی بەدەست نەهێناوە. وتاری سیاسەتمەداری کورد لە نێوان دوو جەمسەری دژ بەیەکتر، نارێك و بێ بەرپرسیارێتی، ئاراستەی میللەت دەکرێت. یەکێکیان ڕابردوویەکی تاڵ و پڕ لە مەینەت و نائومێدی، دەربەدەری و پەراگەندەبوون و برسییەتی، بە کۆمەڵکوشتن و ئەنفالکردنی ئینسانی کورد و داگیرکردنی خاك و شێواندنی ناسنامە و گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستانە، کە ئەمە وەك ئەزموونێکی زۆر گرینگی مێژووی شۆڕشی کورد و ئیمڕۆی کۆمەڵگەی کوردستانی، سیاسەتمەداری کورد نەیتوانیوە جێگەی ئەو ئەزموونە لە وتاری سیاسیدا بکاتەوە و قورساییەکی نیونەتەوەیی پێ ببەخشێت و بیکا بە بنەمای کۆمەڵێك ئەنجامی سەردەمی و سەرەتای ئەزموونێکی تازە. جەمسەرەکەی دیکە، ئەو ئەزموونەی ئێستایە، کە وابزانم کەسی سیاسی کورد هێشتا وەك حەقیقەتی خۆی تێنەگەشتووە و ناتوانێت هەڵیسەنگێنێت و بیگەڕێنێتەوە سەر سەرچاوەکانی خۆی، هەندێ جار وەك گەورەترین ئەزموونی دیموکراسی لە ناوچەکەدا باسی دەکەن و هەندێ جاریش تێکەلاوی گەشەسەندنی (دوبەی) دەکەن، لێرەدا دەبینین هەگیز هەردوو جەمسەرەکە یەك ناگرنەوە، ئەوەش وەك دیباجەکەی دەستووری عێراق دژنکیشۆتانە بەرەو ڕووداوەکان هەنگاو دەنێن. ئەو پەشێوی و ناکۆکییە لە وتاری سیاسی کورد کە لە کایە ڕۆشنبیری و فیکرییەکانی ئەم سەردەمە دابڕاوە، لەگەڵ بارودۆخی ڕۆشنبیری و فیکری نەتەوە پێشکەوتووەکانی جیهان لاسەنگە و ناتوانێ هەلومەرجە بابەتییەکان تێبگات، بۆیە دەبینین ئەو گەشەسەندنەی لە کوردستاندا هەیە دیاردەیەکی ڕووکەشییە، هیچ بنەمایەکی زانستی نییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخێکی سیاسی- ئابووری نەك مێژوویی پەیوەست بە بەردەوامی ڕابردووی شۆڕشی گەلی کورد و ئەو مافانەی کە لە پێناویا هەزارەها مرۆڤ ژیانی لەسەر دانا. چاکسازی و پێشکەوتن بۆ زەمەنی ئێستامان شۆڕشێکی ترە کە لە سەرچاوە سەرەکییەکەوە هەڵدەقولێت، بونیاتنانی ژێرخانێکی کۆنکرێتی نەتەوەیی و نیشتمانییە بۆ هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە، ڕۆشنبیری و هونەر، زانست و ئەدەب، کشتوکاڵ و پیشەسازی، هەروەها پەروەردەیی و تەندروستی و هەموو خزمەتگوزارییەکان، تاکو میللەت کەسایەتییەکی سەربەخۆ و خاوەن پێناسەیەکی خۆی لە ناوچەکەدا هەبێت و بناسرێتەوە. زانست و هونەر و ڕۆشنبیری ژێرخانی عەقلیی نەتەوە پێکدێنن، کاراکتەری مێژوویی و ناسنامەی مرۆڤایەتی پێ دەبەخشێت، ئاستی

عەقڵی سیاسی لە نێو نوخبەدا دروست دەكات و تیۆریای سیاسی تازە دێتەكایەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە هەمانە گرینگی نەدانە و لاچەپكردنی ئەم بوارانەیە، بۆیە دەبینین سیاسەتمەداری كورد لە نێو وتارێكی سیاسی پەككەوتە و خنكاودا خۆی نمایش دەكات كە ناتوانێ هۆشی خەڵك تێر بكات و باس لە قووڵایی چارەنووسیان بكات، تەنانەت لە پرۆژەی دەستووری كوردستانیش زۆر بە دەگمەن و بە شەرمەوە باس لەو لایەنە كراوە، ئەوەتا لە بەشی دووەم، مافە ئابووری و كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەكان، مادەی ٥٤ هاتووە: "یەكەم: حكومەتی هەرێم چاودێریكردنی زانست و ئەدەب و هونەر و هاندانی توێژینەوەی زانستیانە لە ئەستۆ دەگرێت."٧ لێرەدا حكومەتی هەرێم ئەو توانا و ئاستەی نییە زانست و ئەدەب و هونەر و ڕۆشنبیری ببووژێنێتەوە و هاریكاری توێژی ڕۆشنبیران بكات و پاڵپشتی مادی و مەعنەویان بە شێوەیەكی دروست و ڕێك بكات، بەڵكو تەنیا چاودێریكردنی و هاندان لە ئەستۆ دەگرێت، كە ئەویش لە بنچینەدا كاری حكومەت نییە، كاری حكومەت ئەوەیە كە ژینگەیەكی پاك و گەشەسەندنێكی ڕۆشنبیری و ئابووری، خزمەتگوزارییەكی یەكسان و ڕاستگۆ بۆ كۆی گشتی خەڵك بهێنێتەدی و هەموو لایەنەكانی كۆمەڵگە بەیەكەوە بۆ پلەی سەروو بەرز بكاتەوە و گرینگی بە توێژی فیكری و هونەری بدات. ئەم گەشەسەندنەی كوردستان كە بە شێوەیەكی زۆر ناڕێك و نا یەكسان هاتووە، بێ بەشداریكردنێكی تەواوی توێژی ڕۆشنبیر و هونەرمەندان هاتووە، بۆیە دەبینین سیاسەتی حكومەت و هەموو حیزبەكان بارودۆخێكی ئابووری سەرشێتانەیان دروست كردووە كە میللەت بە شێوەیەكی ڕاست و دروست سوودی

لێ نابینێت. خاك و بەروبوومی وڵات لە لایەن هەندێ دەسەڵاتدار و حیزبەکان مۆنۆپۆڵ کراوە، خەڵك بۆتە وەسیلەیەکی بەکاربردنی بەرهەمە هاوردەکان و دەوڵەمەندبوونی نوخبە سیاسییە دەسەڵاتدارەکە، کە زۆر دوورن لە هونەر و ڕۆشنبیری و لایەنە زانستییەکانی دی، هەروەها بەهرە و بەرهەمی داهێنانی توێژی ڕۆشنبیر و ئەدیب و هونەرمەندان نەبۆتە مایەی ژیان و گوزەرانییەکی شایستە، سەرەڕای ئەو سەرمایە و دەوڵەمەندییەی لە وڵات هەیە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ حکومەتی هەرێم کە پێویستە و لە ئەستۆی ئەو دایە پرۆژە و پلانی گەشەسەندن و بووژانەوەی ئەم لایەنە گرینگەی هەبێت. (دووەم: هەموو کەسێك مافی خۆیەتی بەشداری لە ژیانی ڕۆشنبیریدا بکات و سوود لە پێشکەوتنە زانستییەکان و پیادەکردنیان ببینێ و سوود لە پارێزگاریی یاسایی لەو بەرژەوەندییە ماددی و مەعنەوییانەی بەدیهاتوون لە هەر کارێکی زانستی یان هونەری یان ئەدەبی خۆی، وەربگرێت.)٨

ئەو یاساناس و پارێزەر و سیاسیيانەی ئەم دەستوورەیان داڕشتووە، خۆیان لە چ پێگەیەکی کۆمەڵگەدا دەبینن! چونکە مافی بەشداریکردن لە ژیانی ڕۆشنبیری و سوود وەرگرتن لە پێشکەوتنە زانستییەکان لە هەموو دونیا، دەستوور یا حکومەت بڕیاری لەسەر نادات، بەڵکو لە بنچینەدا ئەوە مافێکی سرووشتییە، لەناخی هەر کەسێکدا هەیە بگرە لە منداڵەوە تاوەکو پیری سەد ساڵان. ئەوەی لە دەستووردا جێگەی نییە، هەروەك لە وتاری سیاسی کورد (بە هەموو حیزبەکانەوە)، پلە و پایەی زانست و ئەدەب و هونەر و ڕۆشنبیرییە کە کاریگەری گەورەی خۆی هەیە بەسەر واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بەسەر عەقڵی داڕشتنی یاسا و ئاکاری سیاسی و بەسەر چەمکی مافی مرۆڤ و جوانی و جوانکاری وڵات و لێهاتوویی ئینسانی ئەم وڵاتە.

سیاسەتی فەرمانڕەوایانی کوردستانی بە گشتی و فیکری سیاسی حکومەت بە تایبەتی، نەبۆتە ڕێڕەوێك بۆ بەرەو پێشچوونی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، ئەوەی پەیڕەو دەکرێت ئەنجامێکی دیاریکراوی نییە، ئەزموونی مێژوویی لەسەر بنیات نانرێت، چونکە لایەنی زانست و هونەر و ڕۆشنبیری نییە و تاکو ئیمڕۆ حیسابی بۆ نەکراوە، هەر بۆیەش سیاسەتی کوردی لە نێو گۆڕەپانی نێونەتەوەیی هیچ پێگەیەکی دیاری نییە و کاریگەری خۆی بەسەر سیاسەتی جیهانی نەنواندووە، بەڵکو بە عەقڵێکی سیاسی زۆر لاواز و سستەوە، هەمیشە وەك نەخۆشێك کە بەزەییان پێ بێتەوە، خۆی نمایش دەکات. ئەم دۆخەش بە شێوەیەك کاریکی نێگەتیڤی کردۆتە سەر بواری هونەر و ئەدەب و ڕۆشنبیری، کە ئەویش تاکو ئێستا کەسایەتی خۆی پێکنەهێناوە و ئەدیب و هونەرمەندان نەك لە جیهان و ناوچەی دەوروبەری وڵات، تەنانەت لەنێو کوردستانیش لە لایەن حکومەت و سیاسەتمەدارانەوە، نەناسراون. بەم شێوەیە مێژووی هیچ لایەنێکی هونەری و ڕۆشنبیری، یاخود شارستانی و سیاسی دروست نابێت، چونکە زنجیرەی بەردەوامیی داهێنان و پەرەسەندنی بوارە گرینگەکانی پێناسەی میللەت پچڕاوە و بۆشایی زەمەنی و فەوتانی قۆناغی تێکەوتووە.

سەرچاوە:


١- La realidad como arte. Antoni Tapes. Coleccion de Arquilectura. Murcia "Espana" ١٩٨٩

٢- دەستووری کۆماری عێراق. دیباجە. ئۆگۆستس ٢٠٠٥

٣- De lo Espiritual en el Arte. Kandinsky. Barral . Labor. Barcelona ١٩٨٣

٤- ماالثورة الدينية. الحضارات التقليدية في مواجهة الحداثة. داريوش شايغان. المؤسسة العربية للتحديث الفكري. دار الساقي. ترجمة و تقديم د. محمد الرحموني ٢٠٠٤

٥- داریوش شایغان. النفس المبتورة

٦- La realidad como arte. Antoni Tapes. Coleccion de Arquilectura. Murcia "Espana" ١٩٨٩

٧- ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان- عێراق. پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان- عێراق ٢٢/ ٨/ ٢٠٠٦

٨- هەمان سەرچاوە

# زمانی هونەر لە تابلۆکانی قەرەنی جەمیل-دا

گەلۆ هەرکاتێك کە باس لە زمان دەکرێت، واتە زمان نموونەی ئامرازێکی بەهێزی پەیوەندییەکانی نێوانی مرۆڤەکان لەگەڵ بوونی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی سروشتی، هەر گەلەو بۆتە خاوەنی زمانێکی تایبەتی خۆی، لەگەڵ پێشەوەچوونی مرۆڤایەتیش، بیرمەندان و زانایانی زمانناس، کۆششیان کردووە تا پلەیەك سەبرە سەبرە زمانی ئینگلیزیش نموونەی زمانێکی ئونیڤێرسالی پەرە پێ بدەن بۆوەی لە سەرتاسەری جیهان مرۆڤەکان بەبێ کێشەی زمانی جیاز و ڕەگەزی جیاواز سەودا سەرو مامەڵەی پێ بکەن. خوێنەری بەڕێز ئەوەی ئاشکرایە لە گۆڕەپانی هونەریش هەر هونەرێك خاوەنی زمانێکی تایبەتی خۆیەتی، ئەگەر چی گەیشتنی زمانەکانیش بەیەك ڕاژە و پلەی خێرایی ناگەنە گوێچکەی بینەر و خوێنەر، بەڵام ناکرێت بڵێین هونەرە کپەکان بێ زمانن، نەخێر، ئەگەر چی زمانی هونەری شێوەکاری بە بەراورد بە زمانی موزیك و شانۆ و سینەما و تا دەگاتە ئەدەب بە گشت لقەکانیەوە، خاوەنی هاوار و گەیشتنی دەنگێکی کەمترە، یان دەچێتە خانەی دەنگە کپ کراوەکان، چونکە تەنها دەنگێك کە ڕۆڵی تیا دەبینی ئەوە پەلە ڕەنگ و هێڵ و فیگەر و بابەتەکانن لە کارێکی تاکەکەسیدا دەڕژێنە سەر ڕووی کاڤاڵەکانی هونەرمەند، ڕونتر نموونەی میوزیك و شانۆ و سینەما نیە لە ڕێگای دەنگو ڕەنگو و ڕووخسارەوە بە زوویی بە گوێچکە و چاو بگات. کەواتە تاکە ئامرازی گەیشتنی زمانی شێوەکاری لە ڕێگای پێشنگەی شێوەکارانە لە نێوانی هەر چەند ساڵێك هونەرمەندانی شێوەکار دەتوانن دەنگی هونەرەکەیان بە بینەران و عاشقانی ئەو لقە پرشنگدارەی هونەر بگەیەنن.
هونەرمەند قەرەنی جەمیل نموونەی یەکێکە لە دەنگە هەرە زیندووەکانی هونەری شێوەکاری لە کوردستانی باشوور، واتە هەر لە سەرەتاکانی ساڵانی حەفتاکان قەرەنی نموونەی گەنجێکی بزێو و چالاك، پڕ لە کارێزمایی کارکردن و هەستی بینینێکی قووڵ و مۆراڵێکی بەرز، وەك سەرەتا کەوتۆتە ناو بواری هێڵکاریی و کاری ئەناتۆمی و بەکارهێنانی ڕەنگی ئاویی و ڕۆنی و تا دەگاتە دەیان کەرەستەی تری جیاواز، لە پێناوی دەوڵەمەندی کەڤاڵەکانیدا. هونەرمەند وەك قۆناغی یەکەم بە شێوەیەکی زۆر زانستیانە و چڕ و پڕ، کەوتۆتە ناو جیهانی ئۆتۆپۆرترێت، هەر لە پۆلی یەکەم و دووەمی ساڵەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان بە قەولی زۆربەی هاوڕێکانی، کارە ئەکادیمییەکانی ببووە سەرنجی زۆربەی مامۆستا و قوتابیەکانی پەیمانگە لە شاری بەغدا، گەلۆ قۆناغی دووەمی کارکردن لە لایەن هونەرمەند کە دەکرێت دەستنیشانی بکەم، بە شێوازی دەربڕین، ئەو شێواز و دەربڕینەی کە هونەرمەند وای بۆ

دەچوو کە ڕاستەوخۆ پەیوەندداره بە بیری کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگەیەی کە خودی هونەرمەند چاوی ژیانی تێدا هەڵێناوە و بەشێك لە قۆناغەکانی تەمەنی تێدا هەڵکێشاوە، قەرەنی هەر لە سەرەتای دەستپێکی خزانە ناو جیهانی هونەری شێوەکاری کۆششی کردووە، نموونەی هونەرمەندێکی میللی خۆی بە کۆمەڵگەکەی بناسێنێت. لەو قۆناغە هونەرییەی، واتە کارکردن لەسەر شێوازی دەربڕین، گۆڕانکارییەکی سەرتاسەری بەسەر کارەکانی خۆیدا هێنا و لە کاری ئەکادیمی دوورکەوتەوە، چی لە بواری ڕێژ ڕەنگی پەلە ڕەنگەکان و چی لە لایەنی بابەت و فیگەردا، بە تایبەتیش لە بواری ئاکار و جووڵە و پۆز و فیگەر و پێکهاتەی تابلۆکانیدا، سیمایەکی سەد دەرسەدی کەسایەتیەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردەواری نمایش کردووە، تایبەتیش ئەو تابلۆ و بەرهەمانەی لە لادێ و گوندەکانی کوردستان بەرهەمی هێناون، هەر لە سەر و سیمای مام پیرۆتێك تا دەگاتە پورە ڕەحمە و عەیشێ و فاتێ، جگە لەوەی کۆمەڵێك لە ئاژەڵ نموونەی ئاسك و سەگ و گورگ و گۆلك، باڵەوەریش نموونەی کەڵەباب، هەندێك لە سروشتی کپیش نموونەی لانك، بوونەتە کارکتێرێك لە سمبولی سەرتاپای تابلۆکانی، بە تایبەتیش زۆر هێژایانە مامەڵەی لەگەڵ ڕەنگە کوردەوارییەکان کردووە، بەبێ ئەوەی فەرامۆشیان بکات، بۆیە دەکرێت بێژم هونەرمەند لەو قۆناغەیدا ژمارەیەکی زۆری لە بیری دیمەنەکانی هزردا کردۆتە بیرۆکەی کۆنسێپتێکی تایبەت بەخۆی لە زنجیرە تابلۆیەکی، بێ هەژمار ژیانێکی تری بە ڕەنگەکانی بەخشیوە. ڕوونتر لێرە گەرەکە بڵێم نموونەی پەیامێك بۆ چاوی تەماشاڤان ڕەنگەکانی قەرەنی بوو بە واتای ژیان و، ژیان بەبێ ڕەنگ دەبێتە واتایەکی ڕووتەڵەك لە ڕۆح. گەلۆ قۆناغی دوایی کارەکانی قەرەنی هونەرمەند کە خۆی لە شێوازی هاودەم دەدۆزێتەوە، واتە شێوازی ئەبستراکت، بێگومان ئەو شێوازە هونەرییە کە زیاتر بەر لە سەدەیەك پێش ئیمڕۆ لەسەر بنەمای هزر و بیری هونەرمەندی ڕووسی کاندنسکی لەدایك بوو، کە ئەو کاتانە هونەرمەند لە شاری میونخ یان مونشن، واتە لە وڵاتی ئەڵمانیا ژیانی بەسەر دەبرد، کە بێگومان بەو مانایەی دەکرێت تابلۆیەکی هونەری تەنها لە ڕێگای ڕێژ ڕەنگی پەلە ڕەنگەوە بێتە بەرهەم، واتە ڕوتەڵەك لە فیگەر یان خاوەن فیگەری بێ وردەکاری و بێ دێتا، بەڵام هاوکات بەرهەمە هونەریەکە دەبێت خاوەنی بنەمایەکی تیۆری و بیری بێت. بۆیە هونەرمەند قەرەنی لە شێوازی ئەبستراکت بە شێوەیەکی گشتی گۆڕانکاری بەسەر کارەکانیدا هێناوە، بە

تایبەتیش لە بواری ڕەنگ و بەکارهێنانی ماتەریاڵە جیاوازەکانی تر، کە دەبنە دەوڵەمەندیی کارە هونەریەکە، ڕوونتر دەکرێت بێژم جگە لە بیرۆکە و فیگەر و فۆرم و ڕەنگەکان، ژمارەیەك لە کەرەستەی تایبەتی بەکارهێناوە، کێشی ماتەریاڵی قورستر کردووە لەسەر ڕووی کەڤاڵەکانی، کە گومان لەوەدا نییە لەم ڕێگایەوە چەشەیەکی زێدەتر و بەهایەکی زیاتری بە تابلۆکانی بەخشیوە، ئەوە جگە لە جوانزانی و خاڵە هونەریەکانی تر، کە هونەرمەند مەبەستی بووە بیپێکێت. ئەگەر سەرنج بدەینە گۆڕانکاری لە بواری ڕەنگەکان، قەرەنی ڕەنگی شین و پلەدارکردنی ئەو ڕەنگەی کەم کردۆتەوە، بە هەمان شێوە کەمتر ڕەنگی سوور و سەوزی بەکارهێناوە، یان بە شێوەی ئۆریژیناڵی خۆیان ڕەنگەکانی نەخستۆتە سەر کەڤاڵەکانی، بەڵکو زیاتر ڕەنگی خۆڵە مێشی و زەرد و قاوەیی بە شێوەی پلەدارکردنی ڕەنگەکە بەرەو ڕەنگی خۆڵیی بردوویەتی، ئەو جۆرە گۆڕانکاری و هەڵسوکەوتە سەبارەت بە تابلۆکانی هونەرمەند لێکدانەوەیەکی زۆر هەڵدەگرێت و دەکرێت لە چەندین لایەنی بیری و هزری و دەرونی و سایکۆلۆجی شرۆڤەیان لەسەر بکەین، بێگومان ئەو قۆناغە لە کاری هونەری قەرەنی بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە کە هونەرمەند ساڵانێك ژیانی لە وڵاتی ئیتاڵیا بەسەر برد، بۆ قۆناغەکانی دوای ئیتاڵیاش بەرەو ئیسپانیا و هۆڵەندا ڕۆیشت، کەواتە هونەرمەند لەو قۆناغەدا هەگبەی بیرەوەریەکانی ژیانی کوردستانی کردۆتە باشترین زەخیرە بۆ بەرهەمەکانی، دەکرێت بە هەردوو بواری هەستی و نەستیش کاری لەسەر کرد بێت، هونەرمەند لەو قۆناغەی ژیانی زارۆکی و ڕەنگی خانووە قوڕەکانی لە تەیراوە ژیانی تێدا بەسەر برد، ڕەنگدانەوەی سەد دەرسەدی لە تابلۆکانی تۆمار کردووە. گەلێ ڕاستە کە دەڵێن زۆرجار ژیان و ژیاری هونەرمەندان ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی لەسەر بەرهەمی شێوەکاران دەبێت، ئەگەر لە گۆشە نیگای ئەو بیرۆکەوە سەرنج بدەینە بەرهەمەکانی قەرەنی، ژیانی سادە و ساکاری گەڕەکە هەژارەکانی هەولێر و گوندەکانی کوردستانمان وەبیر دەهێنێتەوە، بە تایبەتیش لە زنجیرە تابلۆی سەگ کە هونەرمەند نموونەی کۆنسێپتێکی هونەری کاری لەسەر کردووە، واتە ژیانی بوونەوەرێکی بە وەفا لەتەك ژیانی کۆمەڵە کە هەوڵ و کۆششی خۆی دەدا لە پێناوی بەردەوامی بە ژیان و خواردن و خەوی لەتەك کۆمەڵگە، کە تا مردن و بوونی بە خۆڵ لە نێو کۆڵان و سەر گوفکەکان نموونەی ڕووداوێکی دڵ تەزێنی خۆڵەمێشی گیان لەبەرێك کە لەکۆمەڵگەی ئێمە هیچ سۆزێکمان بۆی نییە و دەیخەینە سنووری گڵاویی، بە واتای ئەوەی بوونێکی خۆماڵی نییە و مافی ئەوەی نییە ژیانی لەتەك مرۆڤەکان بەسەر بەرێت، ئەگەر چی گەرەکە ئاماژە بەوە بکەم لە لێکۆڵینەوەیەکی نێو جیهانیی، گەورەترین و جوانترین سەگ و بە وەفاترین سەگ، سەگێکە لە کوردستان دەژیت، بەڵام بەهۆی دابوونەریتێکی باو کە لەوانەیە نە هی کۆمەڵگەی ئێمە بێت و نەهی ئاڤێستا و زەردەشت بێت، بەڵام بە سەرماندا سەپاوە و ڕەفتاری لەگەڵ دەکەین. کەواتە دەکرێت بێژم، ژیانی سەگ نموونەی ڕووداوێکی خۆڵەمێشی لەسەر کەڤاڵەکانی هونەرمەند پڕە لە ماناو بیری ڕووداو و ئەرکۆلۆژیای هونەر بەرهەم هێنانێکی هونەری واش هاوکات لە لایەن هونەرمەند بنەمایەکی بیری و تیۆری لەخۆ دەگرێت لە کۆنسێپتێکی هونەریدا. بۆیە ئەگەر لە نێوانی هونەرێکی زانستی و خۆرسك بەرهەمەکانی هونەرمەند قەرەنی شرۆڤە بکەین، بە واتای ئەوەی گریمان لێکۆڵینەوەی جوانزانی زیان بەخشەو بایەخدان و گرینگیمان بە هونەرەوە کەم دەکاتەوە، یان دەیوەستێنێ و نرخی هونەر و زیندوویەتی جوانکاری و بەر هەموو پرۆسێسە هونەریەکان لەناو دەبات، ئەی دەبێت گەلۆ چی بکەین بە سەمکی مەحەك و خاوەن هەستی ڕاستگۆیی بەرامبەر بە زمانی هونەر، خۆ ناکرێت هونەر شی بکەینەوە و لە خاڵی بەهێزو لاوازی بپێچینەوە و بیکەینە شتێکی کاڵو کرچی بێ بەها، یان بێ بایەخ، واتە شتێکی وای تێدا نەهێڵینەوە کە لە ئاکام ببێتە مایەی وروژاندنی هەستی دەوروبەر و مرۆڤەکان، بە گشتی ڕوونتر ئەوەیە بێژم ژیان و ئەندێشەی تێدا بکوژین و لە سنووری ڕاڤەکردن دەری کەین. کەواتە لێرە ڕاستر ئەوەیە کە ڕەفتاری خۆمان بەرامبەر بە هونەر و جوانزانی بگۆڕین و وێستگەیەك بەرامبەر بە هونەر و تاقیکردنەوەکانمان بکەین و زێدەتر و قووڵتر نزیك بینەوە لە چەشەی هونەریمان، نموونەی هونەرمەند قەرەنی جەمیل کۆشش کەین لە توخمەکانی پێکهاتەی بەرهەمێکی هونەری یان کۆنسێپتێکی هونەری زێدەتر تێگەیشتنمان هەبێت، واتە هەڵسوکەوتمان بەرامبەر بە هونەر دوورخەینەوە لە شیکردنەوەی ورد و درشت و لێپێچینەوەی بێ بایەخ سەبارەت بە هونەر و جوانزانی. کەواتە گەرەکە بێژم هەرچەندە بە شێوەی خۆرسك لە هونەر نزیك بینەوە و تواناکانی بەرچەشەبوونمان زێدە بکەین، ئەوەندە تاقیکردنەوەمان سەبارەت بە هونەر

سەرکەوتن بەدەست دێنێ زانستی جوانزانیش دەکرێت بەردەوام بکەینە وێستگەی گەڕانەوەمان لە پێناوی نهێنییە پڕ بایەخ و بەرزەکانی داماڵینی هونەر، خۆشمان دەربازکەین لەم بیرۆکەیەی کە لەوانە بێت جوانزانی چەشەی هونەریمان بشێوێنێ، یان لە ئاکام دا هونەر وا لێبکات ئەو شتە سەرنجڕاکێشەرە نەبێت کە چەشەی لێ وەربگرین!
وا پێدەچێت هەر لەسەر ئەو بۆچون و ڕوانگەیەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، هونەرمەند قەرەنی جەمیل بەرەنگاری کاری هونەری بووبێتەوە، واتە هونەرێکی بەرپا کرد بێت، هاوبەش لە بەهرە خۆڕسکییەکە و گەڕانەوە بۆ زانستی جوانزانی و سروشت و پێك هاتەکانی سروشت بە پێکهاتەی کپ و زیندووەکانی کە لە ئاکام بوونەتە بەرهەمی ڕاستەقینەی تاکو تەرا. هەر بۆیەش بەرهەمە هونەریەکانی قەرەنی سەرچاوە دەگرن لە سروشت و هزر و بیری تاکی هونەرمەند و ئێستیاتێکا، جۆرێك لە بەرهەمی هونەری واش دەکرێت ناوزەد بکرێت بە بەرهەمی بێ وێنە و بێ هاوتا، گەلۆ بە هۆی ئەوەی تابلۆکانی هونەرمەند لە کاری هیچ هونەرمەندێکی تر ناچێت، لە ئاستی شێوە و شێوازی داڕشتندا. گەلۆ ئەگەر چی بە کەڤاڵی گشت هونەرمەندێك دەوترێت تابلۆ و بەرهەمی هونەری، بەڵام تابلۆکانی قەرەنی لە زۆر ڕووی ڕوون و ئاشکرای دیاریکراو لە بەرهەمی هونەرمەندانی تر جیاوازن.
شوێنی گومانمان نین کە لە تاقیکردنەوەی تاکی هونەرمەندێ لەدایك دەبن، وروژاندنی جیاوازمان لەلا دەخولقێنن، بە بەراورد بە بەرهەمی هونەرمەندانی تر، کەواتە دەکرێت بیانخەینە نێو بازنەی بەرهەمی هونەری پڕ لە بەهاو بەرزی هونەریی، واتە هونەرێك لەخۆی نەبێت لە کەسی تر ناچێت، عەشقێك لە سۆز و عەشقی کەسی تر ناچێت، لەوانەیە ئەو ڕووکارەش لە بەرهەمهێنانی لە لایەن هونەرمەند ئەو ڕاز و نیازە بێت کە بەدوای وێڵە کە لە کاری هونەریی و ئەزمونەکەیدا، ئەو دەیەوێت دڵدارێکی جیاوازی هونەر بێت، جیاواز لە گشت دڵدارەکانی تری گۆڕەپانی هونەری شێوەکاری، بشتوانێ هونەرێکی نیمچە ئونیڤێرسالی، هاوکات خاوەن نیمچە ناسنامەیەکی تایبەت بە خۆی و گەلەکەی بەرهەم بێت..
هونەرمەند قەرەنی جەمیل لە دایکبووی ساڵی هەزار و نۆسەد و پەنجا و سێیە لە شاری هەولێر. دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانە لە شاری بەغداد، هونەرمەند زیاتر لە بیست و پێنج ساڵ لە دەرەوەی کوردستان ژیانی بەسەر برد. لە ئەزموونگەریە هونەریەکەی چی لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق بە گشتی و لەسەر ئاستی ئەورووپاش، ژمارەیەك لە پێشەنگەی تایبەت و هاوبەشی کردۆتەوە، ماوەی

شەش ساڵە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، لە شاری هەولێر ماوەیەك بەکاری پەروەردەی هونەریی هەڵدەستا لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی هەولێر. ئێستاش سەرنووسەری گۆڤاری شێوەکارە، گۆڤاری ناوبراو یەکەم گۆڤاری شێوەکارییە کە بە شێوەیەکی ڕەنگین و دیزاینێکی هونەریی زۆر هاوچەرخ لە هەولێر چاپ دەکرێت.

# هەڵوەستەیەک لەسەر قۆناغە هونەرییەکانی (قەرەنی جەمیل)

دارا محەمەد عەلی

ڕۆژی ٢٠٠٧/١١/١٨ پاشی پتر لە ٢٥ ساڵ تەمەنی هونەریی (قەرەنی جەمیل)، ڕۆژێکی نا ئاساییە، بەرامبەر بەو دابڕان و بۆشاییەی نێوان «هونەرمەند و بینەرانی»، لێرەدا تووشی دوو حاڵەتی سایکۆلۆژی دەبینەوە. حاڵەتێك لە (پێدەر) واتە هونەرمەند، حاڵەتێکیش لە (وەرگر) واتە بینەر. حاڵەتی یەکەمی هونەرمەند قورستر دەوەستێ بەرامبەر بە حاڵەتی دووەم، بینەر، لە حەڵەتی یەکەمدا (هونەرمەند- پێدەر) دەکەوێتە لێکدانەوە و بیرکردنەوە، تا ڕادەیەك تووشی ڕاڕایی و دڵەڕاوکێ دەبێ، ئەوەیان لە لایەك، لە لایەکیش هەستکردن بە چێژی «خۆشی و خۆشنوودی» هونەرمەند بۆ ئەو چێژدانە هونەرییەی نێوانیان، پاش زەمەنێك. پرسیارێك سەرهەڵدەدا و دەڵێ: ئایا لێرەدا هونەرمەند دەتوانێ پارسەنگی هەردوولا ڕاگرێ؟ بەڕای من هونەرمەندەکە پتر خەمی خۆیەتی بەر لە وەرگرەکە. ئەو «خەم و ڕاڕایی و ژانە« (١٠٠٪) هونەرییە. نەك کۆمەڵایەتی، بەوەی کە چۆن ڕووبەڕووی وەرگر دەبێتەوە. ئا لەم خاڵەدا بارە کۆمەڵایەتییەکەی وڵاتیش دەبێتە فاکتەرێکی گرنگ لە بەردەم پێدەردا. دەپرسم، ئاخۆ حاڵەتە کۆمەڵایەتییەکەی دوێنێی کورد وەکو حاڵەتی ئەمڕۆیەتی، بگرە هەر لەباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریی، تا دەگاتە حاڵەتێکی گرنگی تاکی کۆمەڵ کە ئەویش (باری سایکۆلۆژییە) هەرگیز نا، ئایا ئەم حاڵەتانە وەکو خۆی ماونەتەوە یاخود (بەرەو پێش یانیش بەرەو پاش) بوونەتەوە. لە وەتەی ئەم (دابڕانە بۆشاییە)ی نێوان (پێدەر و وەرگر) دروست بووە، لێرەوە من دەڵێم هونەرمەند وەکو توێژەرێك - کۆمەڵناسێك بێت و لێتوێژینەوەی ئەو حاڵەتە مرۆییانە بکات و لێیان تێبگات، بەڵام حاڵەتە سایکۆلۆژی و لایەنە هونەرییەکەی قەرەنی جەمیل لەوەوە بوو چۆن بێتە مەیدان و بە چ گوتارێك و زمانێکی هونەریی «وەرگر» بدوێنێ کە (ئەوەیان لای من زۆر گرنگە). چونکە هونەر پەیامێکە و دەشێ وەرگر پەیامی هونەری قەرەنی جەمیل بزانێ چییە و چی بۆ هێناوەتەوە. حاڵەتەکانی وەرگریش چەند جۆرێکن، وەرگر وەکو کەسێکی ئاسایی، وەرگر وەکو کەسێکی نا ئاسایی و کە خۆی لە خود و تاکێکی پێشکەوتوو و ڕۆشنبیر دەبینێتەوە کە ئەوەشیان پتر بە دەستبژێر، ناوزەد دەکرێ. وەرگری سێیەم لە هونەردا لە حاڵەتێکی تری نێوان هەردووکیاندا دەژی و مەیل و هەوڵدانی بۆ پارسەنگیکە نێوان خودی خۆی و توێژەری ڕۆشنبیر و دەستبژێر، کە ئەوەشیان

مەسەلەیەکی خودی ئەم (وەرگر)ەیە و ڕۆژگار یەکلای دەکاتەوە. ئینجا لێرەدا حەزو و ئارەزووو هونەریەکانی وەرگریش دەگۆڕێ بەپێی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و ئابووری و سیاسییە. هەتا ئەو حاڵەتە فەسلەجیانەی کە بەسەر (تاك - وەرگر) هاتووە بۆ پلەی ئاستی چێژ وەرگرتنی هەر لە هونەری کلاسیزمەوە بۆ هونەری ڕیالیزم، تا دەگاتە هونەری نوێ و هاوچەرخی ئەو دەمە، واشی بۆ دەچم (هونەرمەند حەزی لە چی بێت ئەوە دەکا، چونکە سەرکەوتن بە دەست دێنێ وەکو خودی هونەرمەند خۆی) ئینجا هەتا چەند (وەرگر) لێی وەردەگرێتەوە، ئەوەیان مەسەلەیەکی تری هونەرییە. چونکە هەندێ حاڵەت هەن لە گۆڕانکاری نێو هەر کۆمەڵگەیەك کە بە شێوەیەکی سست و خاو دەڕوا و بەرێ دەکەوێ، هونەرمەندیش چاوەڕوانی ئەو هەنگاوە سست و خاوانە ناکا، بەڵکو تێی دەتەقێنێ و سنوور دەبەزێنێ. ئەو دیاردەیەش لە سەرەتا لەسەر ئاستی هونەری کوردی و دەرەوەشدا هەیە، ئەوەشیان زیاتر قەناعەتی هونەرمەند خۆی دەگرێتەوە.

بەڕای من قەرەنی وەکو شێوەکارێك بەبێ حسێبکردن ئەو پێشانگەیەی نەکردۆتەوە و لە دوو نیگاوەش بۆی چووە. یەکەمیان، حیسابی بۆ (وەرگر)ی نوێی خۆی چی لەسەر ئاستی فێر خوازانی پەیمانگە و کۆلێژی هونەر و بەهرەمەندان و خەڵکانی دەرەوەی ئەم دەزگایە کردبێ. دووەمیشیان بۆ ئاستی (وەرگر)ی کۆنی دنیای هونەری خۆی و هەوادارانی بوو بێت، بۆیە «هەر تابلۆیەك، هەر داتاشینێك، یاخود پارچەیەك لە هونەری سیرامیك یانیش هەر کارێکی دیکەی هونەری دی. «تا لای هونەرمەند بێت ئەوە موڵکی هونەرمەندە. بەڵام کە لەلای ئەو دەرچوو ئەوە دەبێتە موڵکی کەسانێکی تر و حیسابێکی تری بۆ دەکرێ. مەبەستم، ئەگەر ئەو کارانە هاتنە نێو نمایش و پێشانگە ئەوە «وەرگر» بە دید و چاوێکی ڕەخنەگرانە دەڕوانێتە ئەو کارانە و خۆی بە خاوەنی دەزانێ. ئینجا لەوەدا من دەڵێم: هەر هونەرمەندێك لە «زەین - زاکیرە»ی مرۆڤدا مایەوە ئەوە ئەو هونەرە خۆی دەپارێزێ و دەمێنێ و کاریگەری دەبێت لەسەر پانتایی هزر و بیر و مێشکی «وەرگر» و بینەر وەکو زەمەن. کێ بێ هەبێت هەندی شاکاری هونەری جیهانی لە زەین و زاکیرە و بیریدا نەمابێت. وەکو شاکارەکانی ئەنجیلۆ — ڕۆفائیل - مۆنالیزای داڤینشی و گێرنیکای بیکاسۆ و کارە بە پێزەکانی دیلاکرۆ و ڕۆبنس و ڤان کوخ و گۆگان و ماتیس و سیزان. هەروەها کارە مۆزیکییەکانی مۆزارت و بیتهۆڤن و باخ و هایدن و شتراوس و پەنجە ئەفسووناوییەکانی

پەگنینی کەمانچەژەن و تا دەگاتە سەر ئاستی ئەدەبیش وەکو شاکارە هەرە دیارەکانی تۆلستۆی و هەمنگوای و دۆستۆفسکی و کامۆ و رامبۆ و مارکیز و سریالیەتی بریتۆن و دەیان و سەدان شاکاری تری هونەر و ئەدەب و زانست و فەلسەفە و مێژووی تری مرۆڤایەتی کە هەر هەموویان بوونەتە بونیاد و چاوگەی مەعریفە و خۆشنوودی و سرووش و جوانی بەخش بۆ نەوەکانی داهاتوو.

لێرەدا قەرەنی جەمیل بۆ نمایشکردنی قۆناغی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدای لەم نمایشەدا لەگەڵ «زۆری و بۆری»دا نەبووە، بەڵکو لەم قۆناغە هونەرییەیدا چەند کارێکی هێڵکاری هەڵبژاردووە وەکو (توێژینەوەی مرۆڤ - مۆدێل) ئینجا مۆدێلەکانیشی پتر پانتایی لە چارەگە مۆدێلدا خۆی دەدیتەوە بە مانا پتر «ئاکارو ڕوو» بوو لە چەند تابلۆیەکیدا گرنگی بە وردەکاری دابوو کە دەچووە نێو قاڵبی «ڕەوتی کلاسیزم». لەوانە پۆرترێتی هونەرمەند «مەدحەت محەمەد عەلی» و هی تریش، چەند تابلۆیەکیش خێراییەکی کەمی قەڵەمی تێدا بەکارهێنابوو وەکو سکێچ، بەڵام سکێچی بونیادی، لێخەفتی و دیراسەکراو هاتبوونە ئاراوە. ئینجا پۆرترێتێکی ئەکادیمی بە ئاوێزە بوون لەگەڵ ڕەنگاڵەییەکانی دنیای ئیمپریسیۆنیزم.

ئەو کارە پۆرترێتانە بنەمایەکی ئەکادیمی بە هێزی هونەرمەند قەرەنی جەمیل-ی وەدەر خست، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕووخسارانە بەدەر نەبوون لە لایەنی باری سایکۆلۆژی کە پتر خاو و خێزانی هونەرمەندی دەگرتەوە، بۆ قۆناغی پاش ئەوەش کە بەلای من قۆناغێکی گرنگی هونەری یەکلاکەرەوەی هونەرمەند قەرەنی جەمیل بووە وەکو کارێکی پراکتیکی نێوان شێوازی ئەکادیمی و شێوازی ڕیالیزمێکی دەربڕینکاری، هەروا بۆ ئاوایی هزر و فیکری هونەرمەند بۆ بارو و دۆخ و ڕۆژگاری سەختی ئەو کات و دەمان لە نەهامەتی و دەردی سەری ئەو میللەتە ستەمدیدەیە و تێکەڵبوونی لەگەڵ باهۆزی نوێگەرایەتی کە لە ناخی ئەو هونەرمەندەدا چەکەرەی دەکرد.

قەرەنی دەیزانی چی دەکا، شکاندنەوە و دووبارە بە وێنا و فۆرمەلە کردنەوەی بابەتەکانی بۆ تاکی گوندی (ڕوستێ) لەسەر ئاستی ڕواڵەت و هونەرێکی دەربڕینکاری بۆ مەدلوول و دەلالەتەکانی «ویژدانی و ئیستێتیکی» بە هەموو هێڵە خوار و خێچ و چەماو و تێکپەڕیو و عەفاویانە لەگەڵ ئەو بزاوتە ڕەنگە مۆر و بۆر و سور و کەسك و قاوەیی و تەڵخ و تۆخانە. ئینجا تێئاخنیان لە مژار و بابەتی هەمەڕەنگی ئەو گوندە. وزە و تەکانێکی تری بەخشییە نێو دەمار و شادەمارەکانی هونەرمەند و لە ئاکامدا وەکو گڕکانێك بەڕووی حاڵەتە سایکۆلۆژییە ئاڵۆزەکانی خۆیدا تەقییەوە، هەرچی هەیبوو

لە ناخیدا هەڵیڕشتە سەر پانتایی و ڕووکەشی تابلۆکانی.. هونەرمەندی بە ئەزموونیش هەردەم لە ڕاڕایی و ترسێکی دەروونیدا دەژی بە مەبەستی سەرکەوتنی لەو بوارە هونەرییەی کە هەڵیبژاردووە، کە ئەوەشیان ترۆپکی بەهرەمەندی و ڕاستگۆیی هونەرمەند دەردەخا. (قەرەنی جەمیل)یش لە خەرواری ئەزموونی خۆیدا وەکو «فلاش باك» کە چەند گرنگە بۆ قۆناغی منداڵێتی، هەر بەهرەمەندێك یان هەر داهێنەرێك ئا بەم شێوەیە ئاوڕێك و گەڕانەوەیەکی فەنای زەمەنەکانی خۆی کردووە وەك وەبیرهێنانەوەیەکی «پیرێ و دوێنێ»ی کە بە پەیمانگەو گوندی ڕوستێ دەگەڕێتەوە. ئینجا قۆناغی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەك فێرخوازێکی «ئەکادیمی زانستی» لەم بوارە شێوەکارییەدا، وەدەردەخا. قەرەنی زۆر زەحمەتە وا بە ئاسانی دەستبەرداری گوندی ڕوستێ بێت، من دەڵێم: ئەو کاتەی ڕووی لە ئەورووپاش کرد هەگبە هونەرییەکەی ڕوستێی لە نێو دید و دڵ و مێشکیدا هەڵگرتبوو. هەر وەکو دەڵێن: بەو بایە دەژیا کە لە ڕوستێوە بۆی دەهات، دەنا ئەوەتا لە هونەری دەرەوەی ئەورووپاشی کە کۆمەڵە تابلۆیەکی بە جیاو لە هۆڵێکی تردا نیشانی دابوون، تا دەگاتە ئەو کارانەی پاش گەڕانەوەشی کە لە کوردستان ئەنجامی دابوون، سیمبۆلی سروشت و گورگ و خەنجەر و بیرو چاڵ و دەلاقە و کچ و مەرکان و سەگ و تاژی و درز و کون و کەلەبەرەکانی زەوی و بان، ئامادەییان هەبوو. بەڵام ئەمجارەیان لە فۆرم و شێواز و هونەرێکی ترو نوێوە، تا دەگاتە چارەسەری تابلۆ لە کەرەستە و ماتریاڵی جیای ئەو کۆمەڵە بەرهەمەی دواییەیدا.. ڕەنگی (ئەکریلك) شوێن ڕەنگی ڕۆنی زەیتی گرتۆتەوە، ڕەنگی خاکی ڕەنگی (سیادی) نێو تابلۆکانیەتی.

ئەو کۆمەڵە بەرهەمە بریتییە لە وێناکردنێکی ئاوێزانەی هەندێ ڕواڵەت و چەمکی هونەری. وەکو بینینێکی خێرایی ڕووکەش تابلۆیەکی ئەبستراکت لەنێو دیدگاتدا گوزەر دەکاو تەنها ڕێڕەوێکی هونەرییە و دیاردە باوەکان وەلاوە دەنێ. بەڵام هەر لەگەڵ یەکانگیرێتیدا لەگەڵ تابلۆکانی بەرەو ئاوایی «ڕیەل + سیمبۆلەیشن» لە وێناکردنی هەندێ دەلالاتی هێماگەریت دەبا بۆ نموونە (خەنجەر)ی کوردی کە ڕەمز و هێمایەکە بۆ تاکی کورد و وەزیفە و مەبەست و مانای خۆی هەیە. کەوا بوو وەکو بینینێکی سەرپێیانە لە تەماشاکردنی یەکەممدا تەنیا چەمکێکی ئەبستراکت خۆی خزاندە نێو دیدەکانم، دەکەواببوو هونەرێکی داماڵینم لە دوورەوە خوێندۆتەوە. بەڵام لە تێرامانی دووەمدا بونیادێکی تری هونەری خۆی سەپاندە نێو بینینی چاوەکانم کە «ڕیەل + سیمبۆلەیشن» واتە واقیعییەکی ڕەمزی هێما گەری بوو.

کەواتە هونەرێکی ئاوێزان و تێك ئاڵاَیی نێوان ئەو چەمکە هونەرییانە بوو، ئەوەشیان لەسەر زۆرینەی تابلۆکانی قەرەنی جەمیل ڕەنگی دەدایەوە، ئەو (دەلالەتە هێماگەرییانە)ی کە لەنێو بەرهەمەکانی ڕەنگی دابوونەوە وەکو ((موفرەدەیەکی بزاوتە)) دەوری خۆیان گێڕا بوو، بگرە هەر لەو ڕەمز و هێما و نیشان و دەلالەتانەی کە باسمان لێوە کرد هەتا دەگاتە سەگ و گورگی تۆپیویش هەر هەموویان مەبەستی تایبەتی هونەرمەندی لە پشتدا هەبوو، ئەگەر دەلالەتی ڕاستەوخۆیش بە دەستەوە نەدەن، ئەوە هەر وەکو دەیزانن ئەو هێما و نیشانانە کورتکراوەی ئەسڵی واقیعن، لە میکانیزمیەتی کار و تێڕامانی بەرهەمەکاندا وەکو (مادە و ماتریاڵ) لە زبریی و لووسیی و بارستایی و بە ڕووکەشی تابلۆکاندا دیار بوو، کەوابوو بۆ لایەنی «تەکنیك» مامەڵەی خۆی لەگەڵ بەرهەمەکانیدا کردووە. لە پاشاندا دیاردەی ڕەهەندی ئامادەیی هەبوو لە زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمەکانی هەر وەکو تابلۆیەکی واقیعی کە ئەو دیاردەیە تیایدا پێویستییەکی هونەرییە. ئینجا ئەو بۆچوونانەش لەگەڵ «ڕەهەندی ژینگەیی» یەکتر دەگرێتەوە و جارێکی تر هونەرمەند پەلکێش دەکاو دەیگێڕێتەوە بۆ باوەشی گەرم و پڕ ماناکانی، بەو هیوایەی هونەرمەند زێتر قووڵ بێتەوە و بۆ خوێندنەوە و درکاندنی نهێنییەکانی ئەو، لە دواییدا ئەو «ئاگایی ڕەنگی»یەی نێو دید و چاوی هونەرمەند، لەگەڵ ڕەنگە ناسراوەکان بۆ هەندێ لە تابلۆکانیدا جیاواز بوون، بەڵام هەواو کەش و کایەیەکی جادووگەرانە دەبەخشێتە نێو چاو و جەستەی وەرگر.

"بۆ ئەوەی بە دوای ڕەنگی بێ ڕەنگ بگەڕێی، دەبێ ماندووبی، مێژوویەك بۆ ڕوانین دروست بکەی"
... یەکێك بێنە بەرچاوی خۆت، پانتۆڵێکی خاکیی و کراسێکی ڕەشی نیو قۆڵی لەبەردایە، لە ناوەڕاستی دەشتێکی کاکی بە کاکی وەستاوە و کزەبایەکی گەرم و هێمن یاری بە پەرچەم و نیگای دەکات و لە هەموو لایەك پووش و پەڵاشی زەرد و خاکی سوور گەمارۆی داوە. لە ئاسۆی دوور، ڕەش و سپی تێکەڵاوە و شاخە دوورەکان وەك بارستاییەکی دراماتیکی قیت بوونەتەوە و لەم لاشەوە، لە دووریی چەند مەترێك لەم نیگایە، ئێسك و پروسکی سەگێکی پیرۆز دەبینرێ، ڕزاوەتەوە و تێکەڵاوی خاك بووە. بە چەشنێك دیارە، دەڵێی لە بنچینەدا ئەم لاشە ڕزیوە و شی بووەوە، لێفێکە لەم دەشتە بەجێماوە و بە حوکمی باران و گەرمایی و هاتوو چوونی داڵەکان و زەمەنیش، ڕزیوە و سەرەنجام، یەکێك هاتووە، هەندێ ئێسك و پروسکی سپیی بەفرینی سەگێکی لەسەر داناوە کە بە چەشنێکی موجەسەم هەستی پێدەکرێ.
ئاوڕ بۆ لایەکەی دیکە دەدەیتەوە، کۆمەڵە بەردێکی ڕەش و سپی و بۆر دەبینی، لەلا چەپییەوە، قەبرێك دیارە، کە قەبری هەموومانە، بە ڕەنگی ڕەش دوو وشەی لەسەر نووسراوە، لەبەر نارێکی هێڵ و خەتەکان بە زەحمەت دەخوێندرێتەوە. لە ئاستی چاویش کۆمەڵێك سواڵەت و تاسوڵقەی شکاو و پارچە گۆزە، بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو و نارێك دەبینرێت. هەندێ پارچەیان بە خەزەفێکی ڕەنگ و پیرۆزەیی سواق دراون و لەبەر هەتاو دەتریسکێنەوە و تاڵە تیشکەکان، وێڕای شەوقدانەوەیان هێرش بۆ بن پێڵوەکان دەبەن. چەند پارچەیەکی دیکە، قوڕێکی سوور و مەیلەو ڕەنگ خەمی، ڕووخساری ئەم خەزەفە ڕەنگ پیرۆزەییانەیان شاردۆتەوە. کەمێك لەولاتر، بنە دڕکێکی وشکی زەرد دەبینی، وەك تەڵەو فاقێك کیسەیەکی نایلۆنی شینی بە دڕکەکانی گیر کردووە و خستوویەتییە باوەشی خۆی. بای گەرم و هێمنی ڕزگارکەر، توانای ئەوەی نییە لەم بەڵایەی ڕزگار بکا و کەمێکی دیکە بچیتە پێشەوە، بۆ ئەوەی ئەمجارە لە بنە تەڕکێك یان لە باوەشی قەلقەشانگێك بگیرسێتەوە، سەرەنجام خەبات بەردەوامە، هەستی درامییش لەوەوە دەردەکەوێت کە نشووستی و نیگونییەکانیش بەردەوامن.
لە ئەندازەی بینینی چەند سەد مەترێکەوە، چەند خانوویەکی قوڕو کەلاوە لە دوور دەبینرێن، چەند ژن و قەڵافەتێکی مەیلەو سپی و ڕەشی پیاوان و هەندێکی دیکەی سوور و مەیلەو سەوز و بنەوشەیی و زەردی ژنان، وێڕای بەرانپیلی ڕەش و هەوری ڕەشی پڕ هێڵی سپی و ڕەنگ هەناری، بە ئاستەم دەبینرێن، لە دەوری خانووەکان و لەو فەزا بێ پایانە دێن و دەچن، دەڵێی چەند شەبەنگێکی ڕەنگینن لەبەردەم ئاسۆی لێڵی خاوە ڕەنگێکی بۆری مەیلەو شین کە هەندێ جار تریسکە دەهاوێژێ، دوو جار لە بەرامبەریان پێڵووی چاوێك دێنەوە. ئەم ئاسۆیە تەختەی شانۆیەکە کۆمێدی و تراژیدی کارێکتەرەکان، ڕەنگەکان خۆیانن، جەژن و کارەسات، چیرۆك و سەربردەی تەنیا ئەو بینەرە دەگێڕنەوە کە هونەرمەند خۆیەتی، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین، ئەم چیرۆك و سەرگوزەشتەیە، تەنیا هی چاوێك یان نیگا و ڕوانینێکی ئاسایی نییە، بەڵکو چاوێکە، نیگایەکە، حەشارگە و ڕوانینێکە لە دایکبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی لە دایکبوونی گەلگامێش و ئەفسانە مەزنەکان و لە دایکبوونی خاڵ و پیت و هێڵ و ڕەمز و لە دایکبوونی خۆی، سەردەمی گۆزە خەزەفدارە تەمەن پێنج هەزار ساڵەییەکان، ئەو گۆزە خەزەفدارە کۆنەی باپیرەی ئەو سواڵەت و تاسولقانەن کە ئەو لە بەرامبەر خۆی لە دەشتە کاکی بە کاکییەکە لە ئەندازەی بینینی خۆی دەیانبینێ.
هێشتاش... ئەو ڕەنگانەی لە شێوەی بەژن و قەڵافەتی باریك، لەبەردەم ئەو ئاسۆ ڕەشە و لەبەرەم ئەو شاخە دوورە بەرجەستانەی باوەشی ئاسمان دەبینرێن کە وەك شانۆیەکە بۆ چاوی ئاوارەی ئەو بینەرە تەنیایەی ناو ئەو دەشتە کاکی بە کاکییە، چەند هێڵ و ڕەنگێکە، لە شێوەی گیانلەبەر، لە ناکۆکی و پێکدا هەڵپرژان و یاخیبوون و دەست لەملانەی یەکترن.
هەندێجار سواری سەر ملی یەکتر دەبن، لە ناکاو لە فەزای گوێ، دەنگی تەقەیەکی گەورە دەبیسترێ، سەرەنجام، ڕەنگی سووری چریسکەدار، ڕەنگی خوێن هێرش دوێنێ و دەبات، هەڵدێ و دەکشێتەوە، ئەو ئاسۆ شانۆیە داگیر دەکا و ڕێچکۆڵەیەك، هەندێجار بە هێڵی باریك، هەندێجار لە شێوەی فوارەیەك، هەندێجاریش بە تەوژم و سەختی لێشاو دێنێ و تا بن پێی ئەو کەسە ڕاناوەستێت کە لە چاوەکانی، واقیعی، سەخت، پیت و خەتی دراماتیکی لە جیاتی فرمێسك بەردەبێتەوە، بەڵام هەر زوو لێشاوی ڕەنگی سوور دەگەڕێتەوە، لەولاشەوە زەرد و شین ماسوولکەکانیان پیشان دەدەن و بە شەرمنییەوە دەیانەوێ، بێنە

سەر تەختەی شانۆ، بەڵام شانۆ چۆڵە و لە ڕەنگی سپی لە هیچ لایەکەوە هیچ ڕەنگێك دیار نییە، جار بە جاریش، دڵۆپێك لە ڕەشایی دەکەوێتە ناو ئەو فەزا سپییە بێ پایانە، لە ناکاو فوارەیەك دروست دەکا و دڵۆپ و هێڵە ئاوە ڕەشەکان، لە شوێنی خۆیاندا قەتیس دەبن و بستێکی تر چییە ناتوانن بچنە پێشەوە و بەرز ببنەوە. گەلێ جاریش بە پێچەوانەوە، شانۆ تاریکە و لەناو ئەو فەزا ڕەشەدا، ئەو جیهانە نووتەکە و بێ نووزەیەدا، دوو هێڵی سپی و سووری تیری بە ئاستەم دیار، دەکەونە دوای یەکتر و سەرادووی یەکتر دەنێن، سەرەنجام، دوای ماندوو بوون، ڕەشاییەکان، وەك ئەژدیهایەکی حەوت سەر، هەردووکیان قووت دەدا. پاشانیش هەر حەوت سەری ئەفسانەیی بەیەکەوە دەڕشێنەوە و یەق دەبنەوە، شانۆ لە ناکاو پڕ دەبێ لە ڕەنگی بێ ڕەنگ، ڕەنگی هەموو دڵێکی پەژمووردە و سەرکێی پڕ لە حەسرەت و هەناوێکی پڕ لە ئاهـ و بەردی سپی.

لەبەردەم ئەم لێکدان و ناکۆکییەی ڕەنگەکان، لەبەردەم شەڕ و جەنگی ڕەنگەکان لەگەڵ یەکتر و لەناو یەکتردا، لەبەردەم ئەوەی ڕەنگ برای ڕەنگی دیکەی دەکوژێ، لەبەردەم ئەوەی پێکەنین بەرگی مەرگ دەپۆشێ و لەبەردەم سەرهەڵگرتنی ڕەنگی زەرد و سەوز و شین و بنەوشەیی، ئەو کەسە، ئەو چاوە، ئەو نیگایە، دەیەوێ لە ڕەنگە یاخییەکانی ئەم دەشتە کاکی بە کاکییە پڕ لە پووش و پەڵاش و بای گەرم و هێمن بەجێ بهێڵێ بەسەر بارستایی شاخە بۆر و سپییەکانی باوەشی ئاسمانی بێ باك تێپەڕێ، ئەوە خوایە، لەوێ، لەمدیو، هەندێ ڕەنگی هێمنتر، چیرۆك و سەرگوزشتەی کۆمیدی و تراژیدی ئەوە چاوە تەمەن هەزار ساڵە بگێڕێتەوە کە لەسەردەمی گەلگامێش- ەوە، لە سەردەمی لەدایکبوونی یەکەم گۆزەی سیرامیکی ڕەنگ پیرۆزەیی، نووزەی دێ و خەبات لەگەڵ خۆی و جیهان و دار و بەردا دەکا. هەندێجاریش لە ژێر زەمینێك، هەندێجاریش لە بن سوولاوکەی دیوارێکی قورین کە شەبەقێکی تێدایە، لەوێ، هەموو بەیانییەك لێیەوە خۆر لەدایك دەبێ و دەمرێ و هێرش دێنی و سەرەنجام جوگرافیایەکی ناوێزە و سەخت لە کۆڵانەکانی لێواری شار دروست دەکا.

لەبەر ئەو گەرماییە بەتینە، لە کاتێکدا ژیان تەواو لە قووڵایی ژوورەکان و بن هەیوانەکان و لە تەنیشت کووپەی گەورەی پڕ لە ئاوی فێنك، یان بەر سێبەری لادیوارێك، یان بن قاڵدرمەیەك، یان تەنیشت کەندوویەکی پڕ لە ئاردی سپی، یان لە ڕەشایی بنەبانی ژوورێك کە دار هەرزاڵەیەکی لێیە، پڕی سەری هەمبانەی مۆر و سوور و زەردە، خەوتووە، لە کاتێکدا ژیان لە هەموو ئەو شوێنانە بە ئارامی خەوتووە، لە ناکاو، دارەبازەیەك دەبینین، لە کۆڵانی پڕ لە گەرمایی و ڕەنگی زەرد، لەسەر شانی چەند کەسێك بەرەو تاکە گۆڕستانی شار تێدەپەڕێ و لەوێشەوە، ڕەنگ و پیت و خاڵ و هێڵی خوار و خێچی هەزار ساڵەی نووسراوەکانی سەر کێلەکان، هێرش بۆ چاو دەهێنن و بە تەواوی لەشدا هەڵدەگەڕێن، پاشان تەواوی قژ و بژی ئەو چاوە داگیر دەکەن و سەرەنجام بە قژی لە پیت و هێڵ و خەت خەتۆکەی نارێك و پێك، دڵیش پڕ لە کۆلارە و قوشکاغەز و دەفتەری ڕەسم و فەنەرەکانی ئاسمانی ئێوارانی شار. ئەو چاوە، ئەو نیگایە، سەر هەڵدەگرێ و سەرەنجام، لە ولاتی ڕەنگە ساردەکان، کەتیایاندا ڕەنگە گەرمەکان خەوتوون، لە شارێکی پان و بەرینی پڕ لە کۆڵانی تاریك و تەسك، پڕ لە کۆتر و پشیلەی ڕەش و ئاسمانی پڕ لە بەفر، دەگیرسێتەوە، لەوێ خەون بە هات و چوون، مردن و ژیانەوە، خەبات و نشووستی و ڕاوانانی یەکتری، گۆزە خەزەفدارەکانی ئەم دەشتە کاکی بە کاکییەی لێوار شاخە هەڵتۆقیوەکانی ئاسۆ دەبینێ، بەڵام ئەم چاوە یەکەم هەنگاو بە خۆیی و زەمبیلێکی پڕ لە ڕەنگ و پیت و هێڵ و فوارە و شەپۆل و خۆڵ و خوریی ڕەنگاو ڕەنگ و وردە بەرد و زیخ و چەوی ڕەنگاو ڕەنگ و زنجیرێکی بارێك و قەڵەمبڕێکی دەستکداری تەمەن سەد ساڵە و شمشاڵێك و پارچە سواڵەتێك و خەزەفێکی چاووزار و هەندێکی پەڕ و باڵی کۆتر و هەندێ بای گەرم و هەندێ نیگای وێڵ و ئاوارە و هەندێ دیکەی پڕ لە خوێن و گریان و تۆپەڵە قوڕێك کە دەتوانێ شکڵی هەموو ئەم جیهانەی لێ دروست بکرێ، دەنێ. کەی ئەم چاوە یەکەم هەنگاو دەنێ؟ بێگومان، لەو کاتەوە کە شەپۆلی ڕەنگی سوور، ئاسۆی دوور دەگرێ، کە شەپۆلی خوێن، ڕەنگی سپی بۆر، بۆری سپی، ئاسمانی کرچ و کاڵ، زەردایی پڕ لە بۆن بۆ گەنینی دەشتی تێکەڵ بە لاشەی ڕزیو و گەڵای ڕزیو و چاو و دڵ و ڕووخساری ڕزیو و دەست و پێ و ئەژنۆی ڕەش و شین هەڵگەڕاو، پڕ لە ئێسك و پروسکی سپیی بریقەدار، قۆچی مەزنی نێرییەك، وێڕای دەرهاتنی لە ناکاوی

تاقە خەنجەرێکی مێژوویی کە لەبەر پڕدێنەکان هەڵاتن و هاتن وەك بای چەمووش و بەرەڵا، بەخێرایی تاڵە تیشکێکی ڕۆژ کە لە پشت شاخە زەلامەکانی ئاسۆی بۆر هەڵدێ، هات لەبەردەم چاوە پڕ لە جەژن و شادییە مێژووییەکان، پڕ لە دراما مێژووییەکان، چەقی و ئیتر لەوساوە ئەو خەنجەرە، لەناو سوورایی خوێنی کاڵ بووەوەی بەر هەتاوی گەرم، کە لە هەندێ لاوە خوێنی وشك بووەوە بە قەد گەڵایەك جێگای خۆی بە حوکمی هەڵکەوتی فیزیکی، بە حوکمی درامای باو جوگرافیای سەست و جووجەڵە شتەکان، بەجێ هێشتووە و چەقیوە، ئەم خەنجەرەش بە چەشنێکی وا چەقیوە، نە دێوی سپی ناو ئەفسانەکانمان، نە هی ڕەشی ناو ئەفسانەکانمان کە ڕەمزی خێر و شەڕن، نە پاڵەوانە بازوو ئاسنینەکانی گریك و ڕۆمانەکان، نە ماسولکەکانی گەلگامێش، بە هی هیچ کەسێك هەڵناقەنێت و دەرنایەت. خەنجەرەکە تەنیا ئەو کاتە دەردێ کە هێرشی ئاجوج و ماجووج بەم دەشتە کاکی بە کاکییەی پڕ لە پووش و پەلاشە، پڕ لە قەتماغەی خوێنە، پڕ لە هاوار و فیغانی ڕەنگەکان، تێدەپەڕن. بێگومان مەبەستم لە قیامەتی ڕەنگەکانە، کە دەکاتە قیامەتی خوێن و...

ئەو کاتەش قیامەتە و ڕۆژی ڕەستاخیزەو چاوەکان یان بەتایبەتی ئەم چاوە ناوێزە بە هێمنی پێڵووەکانی لەسەر یەك دادەنێ، بەڵام کەی ئەم چاوە یەکەم هەنگاوی لەگەڵ شکانی تەشقی با هاویشت؟ ئەو کاتە کە هێرشی خوێن، ڕەنگی سوور، بارستایی شاخەکانی داپۆشی و هێرشێکی مەزنی لە ئاسۆوە هێنا و ئەو دەشتەی پڕ لە فرمێسك و گریان و پرسیار و شەپۆلدان کرد، بە تایبەتیش ئەو کاتە کە کۆمەڵە خانووە کەلاوە قووڕییەکانی چەند سەد مەترێك دوور لەو کەسە، لەو چاوە، بە زەبری شەپۆل و فوارە سەراوبن بوونی هێرشی ڕەنگی سوور، هەمووی تلیساندەوە. سەرەنجام، قوڕ و خوێن تێکەڵی یەکتر بوون و هەڵکردنی بایە مەزنەکانیش، تەواوی قۆمەتە کایەکانی پاڵ جەنجەڕو بن جەنجەڕ و لێوار گوێدرێژ و بارگیرەکانی ناو هەوێزی بە باکردن و لەگەڵ خۆڵ و تۆزدا، بە ئەسپایی نیشتنە سەر شەپۆلی تێکەڵاو بوونی خوێن و قوڕ. مەبەستم ڕەنگی سوور و قوڕە، لەو لاشەوە، گەرمارۆی هەمان شەپۆلی تێکەڵاو، شالاوی قۆمەتە بەردە سپی و شین و بۆر و بۆزەکانی داو و کێلەکە بە خۆیی و پیتە ناڕێکەکانی، تا نیوەی لەناو ئەو ڕەنگە بی ڕەنگەدا دەبینرا. کیسە نایلۆنەکەی باوەشی بنە درکەکەی دەم با کە لە خەباتێکی بێ وچاندا بوو بۆ خۆ ڕزگار کردن، چەند پروشکێکی سووری پێکەوت و ڕووخساری شێوا. هەموو شتێك بە موجەسەمی و ڕەنگی و لووسی وەك کێلەکە، وەك دەشتاییەکە، لەبەر شەپۆلی ڕەنگ و نیگای ئەو چاوە تەنیایە لەناو بێدەنگییەکی ڕەهاو کپ مایەوە و بەم چەشنە دەبینرا. خەنجەرەکەش لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕەنگەکاندا، ئەویش بە شکۆمەندی بەرز دەبووەوە و چریسکەشی دەهات. لەم سەریش، تەواوی خانووە کەلاوەکان، لەگەڵ زەویدا بوونەوە یەك، تەنیا ئەو دیوارە نەبێت کە دەلاقەکەی تێدا بوو، چونکە لەوێ نیگا خوێن دەبینرا، چونکە لەوێ خۆر لە دایك دەبوو.. خۆر دەمرد.

دوای هێور بوونەوەی زەمین و تێپەڕینی قیامەت، ئەو چاوە ناوێزە کە ساڵانێکی زۆر بوو بەدوای ڕینگە ساردەکاندا لە وڵاتی ساردی خاوەن شاری مەزن و کۆڵانی تەڕ و پڕ لە کۆتر و جیقنە و گەڵای ڕزیوی پان بووەوە، دوای تەئەمولێکی زۆر و گەڕانێکی زۆر بە دوای ڕەنگە ساردەکاندا، بەدوای مۆرووە ڕەنگاو ڕەنگەکان، بەناو هەمان شاخی هەڵتۆقیوی باوەشی ئاسمانی کرچ و کاڵدا گەڕایەوە و هاتەوە هەمان دەشتی کاکی بە کاکی لێواری شاری ئەفسووناوی. بەڵام ئەمجارە بە خۆیی و کۆمەڵێك ڕەنگ، هەموو ڕەنگێك و هیچ ڕەنگێك، ڕەنگی بێ ڕەنگ، ڕەنگی بێ ناسنامە، ڕەنگی بێ مێژوو و پڕ لە مێژوو، ڕەنگی پڕ لە ئەفسانە و دراما و بەفر و خوێن، ڕەنگی هیچ ڕەنگێك، زەماوەندێك لە ڕەنگەکان. کە هاتەوە و لە هەمان دەشت و لە هەمان شوێن وەستاوە. لە تەنیشت هەمان گۆڕ و گۆزە و مەرکانەیەکی شکاو، لە نزیك دیوارە نیوە رووخاوە دەلاقە دارەکە وەستا کە پڕ بوو لە ڕەنگی ڕەشی بێ ڕەنگ، ڕەنگی ڕەشی گورگانی. کەڵبەی سپیی پڕ لە ڕق و لغاوی سووری پڕ لە دڕندەیی، لەوێ وەستا. لەولاتریش، فوارەیەك دەبینرا لە هەموو ڕەنگێك، ئەمەش وەك شەنگەبییەکی نایاب بوو، لقەکانی بەسەر هەموو جیهاندا شۆڕببووەوە. لەبن ئەو شەنگەبییە، خەنجەرێکی ڕەشی دەسك مەیلەو زەرد، بریقەی دەهات، لەپاڵ گۆپاڵێکی ڕەنگ سووری تیژ و ئەستوور لار ببووەوە، دەیویست هەنگاو بنێ، بەڵام ئەم جارە ڕەنگە شینەکان، جۆرەها شین، جۆرەها سپی، جۆرەها کەسك و زەرد و ڕەش و سوور و وەنەوشەیی تەنیا لەو تاقە ڕەنگە دەبینران و دەدۆزرانەوە کە نەدەتوانی هیچ ناوێکی لێ بنێی. بەڕاستی، ئەمەیان دراما و مەرگ و گۆڕستانی هەموو ڕەنگێك بوو، ڕەنگەکان بە مردوویی لە دایك دەبوون و هەر بە مردووییش دەژیان و لە هەمان کاتدا بە مردووییش پیر دەبوون و ڕووبەڕووی مەرگ دەبوونەوە، ئەمەش بانگەوازی سەردەمێکی تاریکە و واقیعێکی تاریك و لە دایکبوونێکی تاریکە. سەرەنجام
هەموو ڕۆژێك هەر قیامەتە،
ڕەمزی ئەمەش
ڕەنگی بێ
ڕەنگە...!!

هێندەی من لە کارەکانی ئەم هونەرمەندە ڕامابم و بۆچەند جارێکیش پێکەوە سەبارەت هونەر دوواوین، لەنێو (تەباو ناتەبا) دا پێکەوە گەرموگوڕ وتووێژمان تەی کردووە، لەگەڵ ئەمەنەشدا، بۆ من یەکەم جارە لە پشت قەرەنییەوە سەبارەت بەم هونەرمەندە شتێك بخەمە سەرکاغەز یان ڕاست تر بڵێم یەکەم جارە سەبارەت بە کارەکانی قەرەنی دیدگای خۆم بخەمەڕوو ، کە ئاستەمە بۆم بتوانم لە کاراکتەری ئەم هونەرمەندە (هێمن و نارازییە) خۆم لابدەم، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە دەمەوێت سەبارەت بە کارەکانی بدوێم.

قەرەنی(ئەوەی من ناسیم) هونەرمەندێك شەرمن لە ژیان و ئازاد لە کاری هونەریی، نەرم و نیان لە هاوڕێیەتی و توند لە بڕیارداندا. ئەمانەش ڕەنگدانەوەی تێپەربوونی ئەم هونەرمەندەیە بەنێو دونیایەکی پڕ لە هەوراز و نشێودا لە وێستگەکانی دووریی و تەنیایی و ژیان لەتەك یادەوەریدا و بۆ هەریەك لەم وێستگانەش هەمیشە رووی تەختی تابلۆ پەناگە بووە.

من هەموو کارەکانی ئەم هونەرمەندە وەك یەك حیکایەتی تەواو نەبوون تەماشا دەکەم، لەنێو کەڤاڵەکانی دا سەرجەم حیکایەت لەنێو جوگرافیایەکی (بێ پێناس )دا دەگوزەرێت، بە تایبەتیش لە دوا بەرهەمەکانیدا، قەرەنی کاتێك وێنەی داماڵراو لە یەکەکانی (ناسینەوە) ی شوێن دەکێشێت لەوکاتەدا ئەتمۆسفێرێك بێ چەق، بێ پاڵەوان، دەهێنێتە بوون، هەرچەندە کە گیاندارێکی تەنیاش بەنێو ئەوپانتاییەدا دەیەوێت گوزەربکات، بەڵام هیچ کات چیرۆکی ئێمە ئەو گیاندارە نییە، بەڵکو چیرۆکی ئێمە ئەو دۆخە دەروونییەیە کە سیمای گیاندارەکە بەئێمەی دەڵێت، لە سەرجەم بەرهەمەکاندا قەرەنی چیرۆکی خۆی دەنووسێتەوە، هەموو کەڤاڵ دەبێتە سێبەر بۆ یەك حیکایەتی گەورە کە بەقووڵایی ژیانی خودی هونەرمەندا ڕۆچووە، لە نێو تابلۆکانی ئەم هونەرمەندەدا شوناسی شوێن دەبێتە پانتاییەکی فراوانتر کە لەهەمان کاتدا گشت شوێن و ناشوێنن دەشێت شوێن لەکارە هونەریەکانیدا ئێرە بێت کەتێیدا من ئەم بابەتە دەنووسم و تۆ نازانیت (کەی و کوێیە) یان ئەوێ بێت کە تۆ ئەم بابەتەی تیا دەخوێنیتەوە و من نازانم (کەی و کوێیە) دەشێت (هیچ شوێن)بێت!

ئەمەش رەنگدانەوەی پاشخانی خودی هونەرمەندە کە تەمەنی خۆی گەریدە ئاسا گوزەراندووە، بەڵام هەمیشە بۆ قەرەنی کارە هونەریەکانی بونەتە پەناگە و نیشتمان ئاڵتەرناتیڤێك بۆ نیشتمان. لە هەمان کاتدا ئەم لێسەندنەوەی ناسنامەیە لە شوێن بیانوێکە کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هونەرمەند هەمیشە بەدوای (ونبو) یکدا دەگەڕێت هەر ئەمەشە کە بەردەوامی بەخشیوەتە هونەرمەند و سەرجەم کێشمەکێشەکانیشی دابەش بوون بەسەر:

ناشوێن - ڕەنگ:

سوتماك - خۆڵەمێش - ئاوێزانێك لە نێو خۆڵو پاشماوەی گرێکی دامرکاو کە ئێستە بۆتە حیکایەتێکی شەرمن ئاماژەیە بە کۆتاییەك کە ئومێدێکی لە خۆیدا حەشارداوە و لە تابلۆکاندا سەراپای ڕەنگ ئەو ماسکەیە کە هونەرمەند لە پشتیەوە دەیەوێت پێناس لەو جوگرافیایە بسەنێتەوە کە فۆرمە ئاشکرا و پەنهانەکانی تێدا دەهێنێتە بوون ، وەك ئەوەی مەبەستی بێت کە حیکایەتی تابلۆ ببێتە بابەتێکی یونیڤێرساڵ بۆیە دەبێت ئەوەی بەشاراوەیی بمێنێتەوە ئەوشوێنەیە کە حیکایەتەکەی تیا دەگوزەرێت، لە هەمانکاتدا یاریکردنێکی هێمنانەیە بە بەها باوەکان لە تابلۆدا.

لێسەندنەوەی پیرۆزی مۆرف:

گۆرینی شوێن لە کارە هونەریەکاندا بە(ناشووێن)، داماڵینی وێنەی مرۆڤ و نمایشکردنەوەی لە وێنەی بونەوەرێکی تردا کە سەراپای تابلۆ بۆتە پرسیارو بەراوردە لە نێوان خەسڵەتەکانی ئەو بونەوەرە و مرۆڤ دا و نمایش کردنی (مۆرف **Morph**)ی مرۆڤ و بونەوەرێکی تر، لێسەندنەوەی بەهاکانی پیرۆزی مرۆڤ لە نێو وێنەدا، لێرەدا تابلۆ پرۆسەیەی یاریکردنە بە پاشخانی شێوەناسی بینەر بەوەی دەلالات لەنێو

کەڤاڵێکدا دەبەخشرێتە بونەوەرێکی تر، کە ئەمەش نامەیەکی تری ناڕازیبوونی هونەرمەندە لە دیوێکی مرۆڤ کەنامەیەکی ناڕازیبوونە لە سەردەمێك کە بەها مرۆڤایەتیەکان تێیدا خراونەتە ژێر پرسیارەوە.

لای قەرەنیش سەگێك لە جیاتی مرۆڤ سۆراخی خۆیدەکات و بۆتە حیکایەتخوانی نێو تابلۆ، لە هەمان کاتدا لە گۆشەیەکی تردا سەرجەم مێژوو دەبێتە تۆپەڵێك خاشاك، وتوێژاڵەکانی تابلۆ دەبنە هەڵگری بەشێك لەمانای چەندین حیکایەتی پەنهان.

حیکایەتی پەنهان - ساو:

لەنێو رووکاری قۆقزو لووسدا ڕەهەندی سێهەم خۆی نیشان دەدات، بەهۆی دانانی قەبارەیەکی زیاد لە ڕەنگ و تێکەڵکردنی بە توێژاڵێك لە کەرەستەی و فزوڵی دەست لێدان لای بینەری دەوروژێنێت، گەر بە وردی تەماشا بکەین لەم چەند ساڵەی دوایدا و پاش هاتنەوەی قەرەنی بۆ کوردستان، ئەم تەکنیکە لەنێوکاری ژمارەیەکی لە هاوڕێ هونەرمەندەکانی هەولێردا سەری هەڵدا.

بەڵام لای خودی هونەرمەند ئەم ساوی بەرجەستە بوونە، سەرئەنجامی نا ئۆقرەییەکە کە هەموو ڕۆژێك پاڵی پێوە دەنێت کە لەسەرهەمان تابلۆ کاربکات، بەم شێوەیە تابلۆ دەبێتە هەڵگری چەندین لایەر (**Layers**) یان توێژ کە یەکتریان داپۆشیوە،کە ئەمەش بە نمایشکردنی پەنهانەکان دەبینرێت. گەرچی کاری شێوەکاری پەیوەستە بە بینینەوە، بەڵام لە هەندێك کاری قەرەنیدا نمایشکردنی شاراوەکان لەنێو توێکانی تری تابلۆدا بۆتە ڕەهەندێکی تر کە بینەر ناتوانێت خۆی لێ لا بدات.

وردبوونەوە لەکارەکانی هونەرمەند لەم دۆخەدا بۆ بینەر، دەبێت تێپەربوون بەسەر (جێ پێ)کانی داو گەڕانەوە بۆ ساتەکانی بونیاتنانی ئەو کارە هونەرییەی کە لەبەردەمیایەتی .

